


زماره ٤ — ساڵی ١٩٩٩

# بەدەوڵەتبوون ئەگەر ویستی ئەندامەکانی نەبێت، میللەتێک ناتوانێت پێی بگات

**لەم ژمارەیەدا:**

* **ئینگلیزەکان هەر لە (١٩١٧/٣/١١)ەوە نەخشەی دامەزراندنی دەزگای راگەیاندن و پروپاگەندەیان بە کوردی هەبوو**
* **بزووتنەوەیەکی درێژخایەن، دوای قوربانییەکی زۆر، لە چەند رۆژێکدا کۆتایی پێ دێت . بۆ؟**
* **ئەدانی پەناگەیەک بە پ.ک.ک بریاری تورک و ئەمریکایە**



* **ئیعدامکردنی ئۆجەلان سوودی تیا نییە بۆ تورکیا**
* **لە حیزبایەتیدا وا فێرکرابووین کە دەبێت خوارەوە ملکەچی بریارەکانی سەرەوە بێت**
* **پرسیارەکە نابێت وا بکرێت پارتی و یەکێتی بخرێنە خانەی تورکیای داگیرکەرەوە**
* **ئیسلامییەکان لە وشەی ئەنفال سڵ دەکەنەوە، توندڕەوە چەپەکانیش بە ناسیۆنالیزمی دەدەنە قەڵەم**
* **جاری وا هەیە بە سێ منداڵ کتێبێکیان هەیە بە نۆرە دەیخوێننەوە**



# دادگای داگیرکەر رەوایی دادگاییکردنی نییە

# ئاڵای کوردستان

گرتنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان تەنیا تەنگوچەڵەمەیەکی سیاسی لە ئەوروپا دروست نەکرد، بەڵکو هەلێکی مێژوویی زۆر گرنگیشی بۆ مەسەلەی کورد رەخساند. ئەگەر سیاسەتمەدارانی کورد بیانزانیایە ئەو هەلە بقۆزنەوە مەسەلەی کوردیان چەند هەنگاوێک دەبردە پێشەوە. قۆزتنەوەی ئەم هەلانە لەوەدایە کە رای جیهانی بۆ مەسەلەکە رابکێشرێت و لە قوژبنی بیرچوونەوە دەربهێنرێت. یەکێک لە خاڵە گرنگەکانی ئەو هەلە مێژووییانە ئەوەیە کە مەسەلەکە دەخاتە بیری خەڵکێکی زۆرەوە و رای جەماوەریی بۆ دروست دەکات. سیاسەتمەدارانی کورد دەبێت ئەو را جەماوەرییە بەکاربهێنن بۆ ئەوەی کە دەسکەوتێکی سیاسی بەدەست بهێنن. لەم کاتانەدا دەبێت ئەو سیمبۆڵ و خاسییەتانە بهێنرێنە پێشەوە کە مەسەلەی کوردی پێ دەناسرێتەوە. یەکێک لەو سیمبۆڵانەی کە لە دەرفەتێکی وادا دەبێت گرنگیی پێ بدرێت و بەبەردەوامی پیشان بدرێت ئاڵای کوردستانە.

ئاڵای کوردستان چۆنە؟ لە هەر دەرفەتێکدا کە کورد بۆی لوا بێت ئاڵایەکی بۆ ئەو حکومەتە داناوە کە درووست بووە. شێخ مەحمودی نەمر، کە حکومەتی کوردستانی راگەیاند، ئاڵایەکی بۆ ئەو حکومەتە دروست کرد (وێنەی 1). قازی محەمەدی سەرۆکی کۆماری کوردستان لە مەهاباد نەخشەی کوردستانی لە ژووری کاری خۆی هەڵواسیبوو. لە رۆژی (1946/1/22)دا، قازی محەمەد کۆماری کوردستانی راگەیاند. مانگێک پێش ئەو بڕیارە، لە رۆژی (1945/12/17)دا ئاڵای کوردستان لەبری ئاڵای ئێرانی لە سەر بینای مەحکەمەی شاری مەهاباد هەڵکرا. بەداخەوە لەدوای ئەو دوو حکومەتە، بزووتنەوە کوردییەکانی ئەم سی چل ساڵەی دوایی بیری ئۆتۆنۆمی و خودموختارییان چەسپاند و ئاڵای کوردستانیان خستە دەرەوەی بزووتنەوەکەوە.

هەموو میللەتێک ئاڵایەکی هەیە کە لە یادێکی میللیدا، یان لە کاتی رووداوێکی جیهانیدا بەرزی دەکەنەوە. میللەتی کورد، نەک تەنیا داگیرکەرەکانی ئەومافەی نادەنێ، بەڵکو خۆشی ئەو مافەی لەخۆی سەندۆتەوە کە ئاڵای هەبێت، بۆیە کە حکومەتی هەرێم دروست بوو لە کوردستانی خواروو، پەرلەمانی ئەو حکومەتە رێی بە خۆی نەدا ئاڵایەک بەرز بکاتەوە و بیکات بە ئاڵای خۆی. بەرزکردنەوەی ئاڵایەک مانای ئەوەی نەدەدا کە دەوڵەتێکی جیایان دروست دەکرد (هەرچەندە ئەوە مافێکی رەوای میللەتی کوردە)، بەڵکو ئەوەی دەگەیاند کە بەراستی پەرلەمانن و حکومەتەکەشیان یاری منداڵان نییە. لە وڵاتەکانی ئەوروپا، ناوچە و کۆمپانیای جیاواز ئاڵای خۆیان هەیە، کەچی حکومەتی هەرێم ئەو مافەی بەخۆی نەدا کە ئاڵایەک بەرزبکاتەوە. حکومەتی هەرێم ئاڵای کوردستانی بەرز نەکردەوە تا خەڵکی کورد لەژێر سایەی ئەو ئاڵایەدا کۆ ببێتەوە و یەک بگرن، لەبری ئەوە پەڕۆی سەوز و زەردی بڵاو کردەوە و خەڵکی فێری ئەوە کرد کە لەبری ئەوەی رێز لە ئاڵای کوردستان بگرن لەسەر پەڕۆی سەوز و زەرد بکەونە گیانی یەکدی. ئاشکرایە کە داگیرکەرانی کوردیش ئەو پەڕۆ سەوز و زەردەیان زۆر لە ئاڵای کوردستان پێ باشترە.

لەم رووداوانەی دواییدا، ئەو کوردانەی بۆ پشتگیری ئۆجەلان خۆپیشاندانیان دەکرد، لەبری ئەوەی ئاڵای کوردستان بەرز بکەنەوە، تەنیا ئاڵای رێکخراوەکەی خۆیان بەرز دەکردەوە. بەو کارەیان پاڵپشتیان لەو قسەیەی حکومەتی تورکیا دەکرد کە گوایە حکومەتی تورکیا گیروگرفتی مەسەلەی کوردیی نییە بەڵکو گیروگرفتی رێکخراوێکی هەیە، ئەو رێکخراوەش تێرۆریستە. لەبری بەرزکردنەوی ئاڵای رێکخراوەکانیان، ئەگەر رێکخراوە کوردییەکان ئاڵای کوردستان بەرز بکەنەوە ئەوە دەسەلمێنن کە کوردیش ئەو مافەی هەیە کە ئاڵای هەبێت. ئەگەر رێکخراوەکان نەتوانن ئەو مافە بەکورد رەوا ببینن، چۆن داگیرکەرێکی کوردستان ئەو مافەی پێ رەوا دەبینێت.

میللەتی کورد وەک میللەتانی دیکە مافی ئەوەی هەیە کە ئاڵای خۆی هەبێت و بەرزی بکاتەوە. خەڵکی کورد چاکترە لە خۆپیشاندان و کۆبوونەوەکاندا، لە ئاهەنگ و یادکردنەوەکاندا، هەر کاتێک دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوت بە شانازییەوە ئاڵای کوردستان بەرز بکاتەوە. رەنگە لێرەدا پرسیارێک بێتە پێشەوە: ئاڵای کوردستان کامەیە؟ لەراستیدا گرنگە نییە کورد چ ئاڵایەک هەڵدەبژێرێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئەو ئاڵایەی هەڵی دەبژێرێت بکرێت بە سیمبۆڵێکی یەکگرتووی کورد. فەلەستینییەکان زۆر پێش ئەوەی کە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمییان بۆ درووست بکرێت، ئاڵایەکیان هەبوو و کە لە جیهاندا بە ئاڵای ئەوان ناسرابوو. ئێستاش کە دەوڵەتیان رانەگەیاندووە، ئاڵاکەیان لە هەموو خۆ پیشاندانێکدا، جا گرنگ نییە چ رێکخراوێک رێکی خستبێت، دەشەکێتەوە. کوردی کوردستانی خواروو لە ساڵی (1970)دا ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی دەست کەوت، بەڵام زاتی ئەوەی نەکرد ئاڵایەکی بۆ بەرز بکاتەوە. ئەو میللەتەی ئاڵایەک بەخۆی رەوا نەبینێت، ناتوانێت دەوڵەتێک بۆ خۆی درووست بکات.




ئەو ئاڵایەی کوردستان کە بە ئەمری شێخ مەحمودیی نەمر درووست کراو و لە جێی ئاڵای بەریتانیا دانرا.




ئاڵای کۆماری کوردستان لە مەهاباد.

# کۆنتراکت

زماره ٤ — سالی ١٩٩٩

**هەموو دەستەڵاتێک دەبێت لەگەڵ ئەو گفتەدا لابچێت کە ناپیاتەسەر**

لەم ژمارەیەدا — نووسەر و کەسەکان — لاپەڕە



---


نامەو ئەو دیسکێتانەی بە Macintoch دەنووسرێت، بۆ ئەم ناونیشانە دەنێردرێت:

Kontrakt
F.stålsgatan 96
754 39 Uppsala
Sweden

نرخی ژمارەیەک لە سویددا بە پارەی پۆستەوە، ٠٤کرۆنە. بۆ دەرەوەی سوید ٤ دۆلار، جگە لە پارەی پۆست.

ژمارەی پۆست جیرۆ:
Post giro:
6196267-6

ئەوانەی دەرەوەی سوید دەتوانن ئابوونەکەیان بە نامە بنێرن.

ئەو وتارانەی بە PC دەنووسرێن، دەنێردرێن بۆ ئەم ناونیشانەی خوارەوە:

Kontrakt
Gladiolusgatan 4A NB
431 61 Mölndal
Sweden

Fax: 031- 7769433

ISSN 1404-0972

# ئاشبەتاڵ،
# شکستی جوڵانەوەکانی کورد

**•خەڵکی کورد هەموو جارێک دڵی خۆی دەدا بە سەرکردەی جوڵانەوەکانی، بەڵام ئەوەی ئەنجام دەدرێت سرووشتی جوڵانەوەکان دەسنیشانی دەکات نەک دڵی خەڵکەکە**

**•سرووشتی جوڵانەوەکان وایە نە دەتوانن سەرکردەیەکی نەتەوەیی دروست بکەن، نە کورد بە مافەکانی بگەیەنن**

**•ئەو رۆڵەی جوڵانەوەکانی کورد دەیبینێت، وڵاتە دەستێخەرەکانیان بڕیاری لەسەر دەدات**

**•بەردەوامدان بە جوڵانەوەیەکی ئاشبەتاڵپێکراو کارێکی مەحاڵە**

**•جوڵانەوەی رێکخراوە خۆبەستەکان تا گەورەتر بێت، زیاتر دەتوانرێت ئاشبەتاڵی پێ بکرێت**

---

**ئاڵە حەفید**
۱۹۹۹/٦/۸

---

### بەشی یەکەم

### بابەتەکە

سالّی ۱۹٦۱، جوڵانەوەی چەکداریی بە ڕابەرایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان لە باشووری کوردستاندا دەستی پێ کرد، بەپێی ئاگایی دکتۆر مەحمود عوسمان دەربارەی ئەم جوڵانەوەیە، هەر لەسەرەتاوە، لەبەر هەبوونی لایەنێکی خێڵەکی لە لایەک و لایەنێکی خوێندەوار لە لایەکی ترەوە، هاوئاهەنگییەک لەناو ڕیزەکانی ئەم جوڵانەوەیەدا نەبوو. کەسانی عەشایەر تا ڕادەیەک دەستیان بەسەر جوڵانەوەکەدا گرتووەو ململانێ تا هاتووە زیادی کردووە هەتا سالّی ۱۹٦٤ تەقیووەتەوە(۱).

سالّی ۱۹٦٤، ئەم جوڵانەوەیە بوو بە دوو بەشەوەو دوو باڵی پارتییان پێک هێنا. باڵێکیان، کە ئیبرایم ئەحمەد و مامجەلال باڵهاوێژی بوون، بە "*جەماعەتی مەکتەبی سیاسی*" ناو بران. ئەم بەشەیان بەگشتی بەشە شاریی و خوێندەوارەکەی دەگرتەوە. باڵەکەی تریان، کە مەلا مستەفا سەرکردەی بوو، زیاتر لایەنە عەشایەر و گوندنشینەکەی پێک دەهێنا.

جەماعەتی مەکتەبی سیاسی لە بەردەمی هێزی مەلا مستەفادا لە پێشدا (سالّی ۱۹٦٤) چوونە ئێرانەوە دوای ئەوە سالّی ۱۹٦٦ هاتنەوە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقیی. ئەمە لە کاتێکدا کە باڵەکەی بارزانی لە جێگای خۆیدا، لە شاخ و لە بەربەرەکانێی حکومەتی عێراقدا، مایەوە.

بەپێی ئەو وەسفەی سەرەوە: سالّی ۱۹٦۱ پارتی دیموکراتی کوردستان بوو بە ئامرازی دروستکردنی بزووتنەوەیەکی چەکداریی، کە ئاڵای "*کوردستان یان نەمان*"ی هەڵ کرد. بەڵام پارتی بە جیابوونەوەی سالّی ۱۹٦٤ جوڵانەوەکەی بۆ مەلا مستەفا بەجێ هێشت و حیزبەئامرازەکەی لە گەڵ خۆی هێنایەوە بۆ ناو حکومەتی عێراق. جیابوونەوەی سالّی ۱۹٦٤ جیابوونەوەی حیزب و جوڵانەوەی چەکداریی بوو لەیەکترییی.

### بچڕانەوەی سالّی ۱۹۷۰

جوڵانەوەی چەکداریی لە لایەک و حیزب لە لایەکی ترەوە بوون بە دوو هێزی سەربازیی و فکریی خەنیمی یەکتریی. ئەم دوو باڵەی پارتی تا سالّی ۱۹۷۰ بە "**مەلایی**" و "**جەلالی**" ناسران. شەڕی نێوانی مەلایی و جەلالیی تا ئەو ساڵە درێژەی کێشا. بەڵام ڕێکەوتنی بارزانی لەگەڵ حکومەتی عێراق لەسەر ئۆتۆنۆمی کۆتایی بە شەڕی ئەم دوو باڵە خەنیمەی یەکتریی هێنا. ڕۆژی (۱۱)ی ئازاری سالّی ۱۹۷۰، بەیانی ڕێکەوتنی باڵەکەی مەلا مستەفا و حکومەتی عێراق خوێندرایەوە. خوێندەوارانی جەلالیی، کە خاوەنی ڕێکخستن، هەڵگری فکری چەپ و ماویی بوون، بەم بەیانە بچڕانەوە. ئەوەی کرۆکی باسەکەی منە ئەمەیە:
بۆ هێزێک بە ڕێکەوتنی دوو لایەنی تر هەڵ دەوەشێت؟

### بڵاوپێکردنەکەی ۱۹۷۵

ئەو ماوەی شەش ساڵە کە ئەم دوو هێزە لە شەڕو دژایەتی یەکترییدا ب
بووە هۆی ئەوەی کە هەردوو لایەنەکە و لایەنگرانیان پڕ ببن بە گیانی تۆڵەو ڕق و دوژمنایەتیی. بەڵام مەلا مستەفا و سەرکردایەتیی هێزەکەی بڕیارێکی ژیرانەیان دەر کرد، کە زاڵ بوو بەسەر ئەو پاشماوەی شەڕەدا. ئەم بڕیارەش بریتی بوو لە لێبوردن کە بوو بە هۆی یەکخستنەوەی هێزی جەماوەری کورد لە باشووری

کوردستاندا و دروستبوونەوەی **ڕووتیکرێنی سیاسیی** (×) بۆ جوڵانەوەی کورد.

دوای چوار ساڵ تێپەڕبوون بەسەر خوێندنەوەی بەیانی (١١)ی ئازاردا، شەڕ لە نێوان مەلا مستەفا و حکومەتی عێراقدا دەستی پێ کردەوە. پاش نزیکەی ساڵێک، ڕۆژی ٦ / ٣ / ١٩٧٥، ئێران و عێراق لە جەزائیر ڕێک کەوتن. لە نێوانی (١٣-٣/١٩)دا مەلا مستەفاو سەرانی پارتی چەند کۆبوونەوەیەک دەکەن. دوا ڕۆژ (٣/١٩) بڕیاری بڵاوەپێکردن دەدەن. بە نزیکەی حەوت ڕۆژ بزووتنەوەیەکی ١٤ ساڵیی کۆتایی پێ دێت. بزووتنەوەیەک کە بە پێی **د. مەحمود عوسمان**:

١. سەرکردایەتییەکەی خاوەنی میزانییەو سامان و داهاتێک بووە کە توانیوویەتی پێویستیی پارەی بەرەنگاریی بۆ ماوەی چەند ساڵێک دابین بکات. میزانییەک کە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٥ گەیشتۆتە ٤٨ملیۆن دیناری عێراقیی ئەوسا.

٢. خاوەنی بە لایەنی کەمەوە ١٥ملیۆن فیشەکی تفەنگ و ڕەشاش بووە. نزیکەی ٥هەزار گوللەی تۆپ و هاوەن و ساروخی بازۆکای هەبووە. ژمارەی ٦٠هەزار چەکداری ڕێکخراو و هەزارەها میلیشیای لە ژێر فەرماندا بووە. ناوچەیەکی ڕزگارکراوی لە شاخ و دۆڵ و دەشت، کە بۆ بەرەنگاریی شیاوە، لە ژێر دەستدا بووە. پانتایی ئەم ناوچە ڕزگارکراوە نزیکەی ٤٠ هەزار کیلۆمەتر دووجا بووە.

٣- بڕەزەخیرەیەکی خواردەمەنی ئەوتۆی هەبووە کە توانیوویەتی بەلایەنی کەمەوە بۆ چەند مانگێک پێویستیی جوڵانەوەکە دابین بکات. دواتریش دەتوانرا بەئاسانیی زەخیرە بکرێت.

٤- جەماوەری خەڵک و پێشمەرگە ئامادەی فیداکاریی و قوربانیدان بوون. ئەم ئامادەییەش بە عەمەلیی لە چەند شەڕێکدا، کە چەند ڕۆژێک دوای ڕێکەوتنەکەی جەزایر ڕویداوە، دەرکەوتووە.

٥- بەردەوامبوونی قورساییەکی تری لە لایەن دۆست و دوژمنەوە دەدا بە گەلی کوردو حسابێکی زیاتریان لە جاران بۆ دەکرد. هەروەها ئەو ڕایانەی دەگۆڕی کە لایان وابوو بزووتنەوەکە خزمەتی سیاسەتی ئەمەریکیی و کۆنەپەرستان دەکات. یەکێتی سۆڤییەت ڕێکەوتنی جەزائیری پێ خۆش نەبووەو لایەن هەبووە کە لەو ڕۆژە سەختانەدا ئامادەیی خۆی پیشان داوە بۆ یارمەتی لە ڕوی عەمەلییەوە(٢).

بۆ هێزێک بە ڕێکەوتنی دوو لایەنی تر هەڵ دەوەشێت؟

### کوردستانچۆڵکردنەکەی ساڵی (١٩٩٦)ی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان

ڕۆژی ١٩٩٦/٨/٣١ پارتی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا هاتەوە سەر هەولێر و ئاڵای عێراقیان لەسەر پەرلەمانی حکومەتی کوردیی هەڵ کردەوە. پاش چەند ڕۆژێک هێزەکانی پارتی ڕوویان کردە شارەکانی تری کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی لە ماوەی نزیکەی حەفتەیەکدا هەموو ناوچەکانی چۆڵ کرد و تا سەرسنوور خۆی نەگرتەوە. ڕۆژنامەکانی سوید هەواڵی ئەوەیان بڵاو کردەوە کە ڕاکردووەکان لەناو ئۆردوگاکانی ناو سنووری ئێرانیشەوە، لە ناو عێراقەوە تەقەیان لێ دەکرێ و لێیان دەکوژرێت.

بۆ هێزێک بەم شێوەیە هەڵ دەوەشێت؟

### سوریا جێهێشتنی عەبدوڵا ئۆجەلان (ساڵی ١٩٩٨)

پاش فشاری دبلۆماسی و سەربازیی حکومەتی تورکیی بۆ سەر سوریا، لە سەرەتای (١٠/ ١٩٩٨)دا، ڕۆژی ١٠/١٩ ئۆجەلان ئاشکرای کرد کە بنکەی سوریای بەجێ هێشتووە. ڕۆژی ١٩٩٨/١٠/٢١تورکیا و سوریا ڕێکەوتنامەیەکیان دەربارەی پ.ک.ک مۆر کرد. ڕۆژنامەی دانگس نیهێتەر (DN)ی سویدیی نوسیبووی وردەکاریی ڕێکەوتننامەکە ئاشکرا نییە بەڵام لەوە دەچێت کە سوریا پەیمانی دابێت کۆتایی بەوە بهێنێت ڕێگای ئەو ئەندامە (پ.ک.ک)یانە لە ناوچەی خۆیدا بدات کە چالاکن. هەروەها نوسیبووی کە قسەکەرێک لە تورکیا هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی سوپایی دەکاتەوە ئەگەر لە کاتێکدا سوریا پەیمانەکەی نەباتە سەر(١) ڕۆژی ١٩٩٩/٢/١٥، عەبدوڵا ئۆجەلان لە لایەن پۆلیسی کینیاوە گیرا و بۆ ڕۆژی دوایی بە فڕۆکەیەک برایەوە بەردەمی حکومەتی تورکیی.

بۆ هێزێک بە ڕێکەوتنی دوو لایەنی تر سەرۆکەکەی بستەزوویەک لەژێر پێیدا نامێنێت؟

## بەشی دووەم

# ئامرازی تێگەشتن

پاش ئەوەی بابەتەکەم دەست نیشان کرد، دێمە سەر ئەو ئامرازانەی کە بەکاریان دێنم بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکە. ئەو ئامرازانەش بەگشتی دوو جۆرن: یەکەم دەسیاوی زمانەوانی؛ دووەم پێتێگی زانیاریی.

### A-دەسیاوی زمانەوانی

هەروەکو چۆن بۆ کردنەوەی بورغوویەک پێویستمان بە دەرنەفیز دەبێت یان بۆ نووسینی وتارێک پێویستمان بە قەڵەمە، ئاواش بۆ شیکردنەوەی بابەتێک هەندێک زاراوە بەکار دێت کە دەبێت واتاکانیان کۆنکرێت و دیار بێت بۆ ئەوەی بتوانرێت

**ئامرازی تێگەشتن**



وێنەیەکی روونی ئەو بابەتە بدرێت بە دەستەوە. بە تایبەتی لەم رۆژەدا کە ژمارەیەکی زۆری نووسەران بێ حساب ژمارەیەک زاراوە بەکار دەهێنن. بۆیە روونکردنەوەی ئەم زاراوانەی خوارەوە بە گرنگ دەزانم.

**١- فەنکشن**

بەلوعە کە دەیکەیتەوە ئاوی لێ دێتە خوارەوە و کە دای دەخەیت ئاوەکە لە بۆریەکەدا رادەگرێت. ئەمەی باسم کرد فەنکشنی بەلوعە بوو. بۆ نموونە فەنکشنی دڵ لێدانە، هی گورچیلە خوێنپالاوتنە و هی قوتابخانە ئەوەیە کە مامۆستا و قوتابی لە شوێنێکدا کۆدەکاتەوە بۆ وانەوتنەوە و خوێندن.

**٢- ئیش و رۆڵ**

ئیشی دڵ ناردنی خوێنە بۆ لەش. ئیشی گورچیلە پاککردنەوەی خوێنە لە میز. ئیشی قوتابخانە فێرکردنی قوتابییە. ئیشی سوپا پاراستنی نیشتیمانە. ئۆرگانێک، دڵ بێت یان خەستەخانەیەک، بۆ ئەوەی بتوانێت ئیشەکەی ئەنجام بدات دەبێت لە فەنکشندا بێت. رۆڵ بە ئیش دەبینرێت. دەتوانین رۆڵ بەوە لە ئیش جیا بکەینەوە کە رۆڵ ئەو روخسارەیە کە ئیش لە پەیوەندی دەرەوەیدا هەڵی دەگرێت. بۆ نموونە، رۆڵی دڵ لە *کۆئەندامی گەرانی خوێندا* ناردنی خوێنە، رۆڵی قوتابخانە *لە کۆمەڵگادا* فێرکردنی قوتابییە، رۆڵی باوک *لە خێزاندا* باوکییە. واتە: رۆڵ ئیشە لە پەیوەندی دەرەوەدا.

**٣- سیستێم**

بۆ ئەوەی دڵ بتوانێت خوێن بنێرێت بۆ لەش ژمارەیەک بەشەئۆرگان بە ژمارەیەک پرۆسێسی یەکتەواوکەریی بۆ هەدەفی خوێناردن لە هاریکاریدان. بۆ نموونە، لە سەرووی لای راستیی دڵەوە ناوەندێک هەیە، لەوێوە تەزووی ئەلیکترۆنیی لێ دەردەچێت و بەسەر دڵدا دابەش دەبێت. ئەم دابەشبوونی تەزووی دڵە لێدانی دڵ رێک دەخات. لەناو دەمارە خوێنبەرەکانی دڵیشدا زمانە هەیە کە لەبەر لێشاوی خوێندا درێژ دەبن، بەڵام کاتێک خوێن بگەرێتەوە بۆ ناو دڵ ئەم زمانانە راست دەبنەوەو رێگای گەرانەوەی خوێن دەگرن. ئەمانەو پرۆسێسی تر هەموویان لە خزمەتی ئەوەدان کە دڵ بە ئیشەکەی خۆی هەڵسێت. ئەو پەیوەندییە هاریکارانەیەی کە بەشە ئیشەکان کۆدەکاتەوە بۆ یەک هەدەف پێی دەوترێت سیستێم. واتە، سیستێم پەیوەندیی هاریکارانەی بەشە ئۆرگانەکانە بۆ هەدەفێک.

**٤- سترەکتوور**

سترەکتوور چۆنێتیی دروستبوونی هەر شتێکە. بۆ نموونە، جۆری دروستبوونی مێزێک بریتییە لە تەختەیەکی پان و چوار قاچ. سترەکتوور، هەدەف دەستنیشانی دەکات. هەدەفی دانیشتن و هەدەفی پاڵکەوتن بریاری کورسی و قەرەوێڵە دەدەن. هەدەفی



وێنەی دڵ

خوێنناردن بۆ لەش وای کردووە کە دڵ ئەو سترەکتوورە وەربگرێت. سترەکتووری ئەو بەشە ئۆرگانانەی کە پێکرا بۆ هەدەفێک لە سیستێمێکدا کار دەکەن، بە رێکەوت دروست نەبوون. سترەکتوور بنکەی ماددی سیستێمە. بۆیە، بۆ نموونە، ئەوەی رێکخراوێک قسەی بۆ دەکات، هەر ئەوەندە قسەیەکی بەتاڵ نییە کە لە پلەی یەکەمدا سترەکتوورێکی هەبێت بۆی. ئایا ئەو دەسەڵاتەی کە باسی دیموکراتی دەکات، سترەکتووری دەزگایەکی دیموکراتییانەی هەیە تا بتوانێت ببێت بە بنکەیەکی ماددی بۆ سیستێمێکی دیموکراتییانە؟ ئایا ئەو کەسەی قسە بۆ کێشەیەک دەکات لە رەفتاردا، نەک بە قسە، هەوڵی داوە بۆ ئەو کێشەیە؟ هەمیشە هەرگیز مەسەلەکە قسەکان نییە کە کەس پەکی ناکەوێت لەسەریان، بەڵکو هێزەکە یان مرۆڤەکەیە کە ئایا تا چ رادەیەک راستە بۆ ئەو قسانە؟ کە دیکتاتۆرێک باسی دیموکراتی دەکات، زۆر جار هەڵەکە لەوەدانییە کە قسەکان ناتەواو بن، بەڵکو لەوەدایە کە ئەو دیکتاتۆرە بۆ ئەو قسانە نابێت. لاوازیی ئەم ئاگاییە لە ناو کولتووری کورددا وای کردووە کە بە ئاسانی لە سەر پرەنسیپی "دەمە چیت لێ کەمە" ئەوەی مێژوویەکی لە بیروباوەرێکدا سەرف کردووە، تاکە کەس بێت یان حیزب، هەر خۆشی کە زەمانەکە وەر دەچەرخێت، بۆی دەلوێت یەکسەر ببێت بە نوێنەری پێچەوانەی ئەوەی پێشووی.

### B- پێتێگی زانیاریی

بەچی لە چی تێ دەگەین؟ بە فیزیا لە فیزیا و بەزانستی سیاسەت لە سیاسەت و بە ئەدەب لە بابەتێکی ئەدەبیی دەگەین. کاتێک مرۆڤێک دەبینین لە مزگەوتێکدا نوێژ دەکات تێ دەگەین کە ئەو کەسە موسوڵمانە. بە چی لەمە تێگەشتین؟ وەڵام: بەوەی کە دەزانین نوێژکردن یەکێکە لە ئەرکەکانی مرۆڤی موسوڵمان. کامەیە ئەو بنەرەتانەی کە پێی لە ئاشبەتاڵ دەگەین؟

پێتێگی یەکەم: **هەر سترەکتوورێک فەنکشنی هەبوو رۆڵیشی دەبێت**

ماشینێک کە سەرقاپی شووشەی شەربەت دەنێتەوە، تا ئیش بکات رۆڵی سەرقاپنانەوە دەبینێت. گلۆپێک هەتا تەزووی کارەبا بە تەلە باریکەکەیدا رەت بکات، رۆڵی روناککردنەوە دەبینێت. رێکخراوێک ئەگەر ئەو ئیشانەی ئەندام و ئۆرگانەکانی دەیان کەن لە خزمەتی نیشتیماندا بێت، ئەوا رۆڵی نیشتیمانپەروەریش دەبینێت.

رۆڵی هەر شتێک بەندە بە فەنکشنی ئەو شتەوە، کە فەنکشنی نەما رۆڵیشی نامێنێت. گورچیلە کە لە فەنکشنی پالاوتن کەوت رۆڵی پاککردنەوەی خوێنیشی نامێنێت. کۆمپانیایەکی خانوودروستکردن بە هەر هۆیەکەوە بێت، کە ئیشی نەما رۆڵی خانوودروستکردنیشی نامێنێت. مێزێک کە فەنکشنی شەرکردنی نەما، ناتوانێت رۆڵی پارێزگاریی ببینێت.

پێتێگی دووەم: **هەموو سترەکتوورێک لەناو هێڵێکی داخراودا فەنکشنی هەیە**

**کەواتە هەر سترەکتوورێک لەو هێڵە داخراوە هاتە دەرەوە کە تیا ئیش دەکات رۆڵی نامێنێت**

ئەگەر گلۆپێک بە دوو وایەر ببەستین بە دوو سەری سارد و گەرمی پاترییەکەوە، دەبینین گلۆپەکە دادەگیرسێت. ئەلیکترۆن لە سەرێکی پاترییەکەوە بە تەلی باریکی گلۆپەکەدا رەت دەبێ و دێتەوە بۆ پاترییەکە. هەر کاتێک ئەم هێڵە داخراوە یاخود ئەم ئەڵقەیە لە شوێنێکدا کرایەوە گلۆپەکە دەکوژێتەوە. خوێن لە بەشی خوارەوەی لای چەپی دڵەوە دەردەچێت و بە دەمارە خوێنبەرەکاندا بە ناو لەشدا بڵاو دەبێتەوە و دیسان بە دەمارە خوێنهێنەرەکاندا

دەگەڕێتەوە بۆ دڵ. فەنکشنی دڵ لەناو ئەم هێڵە داخراوەدایە، هەر کاتێک دڵ لەم هێڵەداخراوە ترازا ئیتر فەنکشنی نامێنێت. ئاو لە زەوییەوە بەهۆی گەرماییەوە دەبێت بەهەڵم و دیسان بە بارانیی دێتەوە زەوی. زۆر کانی لەم هێڵەداخراوەدایە کە وشک ناکات. کابرایەک کە خواردەمەنی دەفرۆشێت هێڵێکی داخراو لە نێوانی بەکۆمەڵفرۆش، دوکان و کڕیاردا پێک دێنێت. هەر کاتێک لە هەر شوێنێکدا، نەمانی کەلوپەلی بە کۆمەڵ بێ یان خراپیی بەڕێوەبردنی دوکانەکە یان نەمانی کڕیار، ئەم هێڵە داخراوە بەرەو ترازان ڕۆشت ئیتر فەنکشن و ڕۆڵی دوکانەکە ڕوو دەکاتە کزیی و نەمان.

پێتێکی سێیەم: **سیستێمی هەر هێڵێکی داخراو دەسنیشانی فۆرمی هەر سترەکتورێک دەکات لەناو ئەو هێڵەدا**
سیستێم پەیوەندیی هاریکارانەی بەشەئۆرگانەکانە بۆ هەدەفێک. ئەم پەیوەندییەش بێ حساب دروست نابێت. هەدەفی روناککردنەوە "پاتری" و "وایەر" و "گلۆپ" دەخوازێت. سیستێمی خوێنگەران لە لەشدا دەسنیشانی فۆرمی دڵ و دەمار و بەشەئۆرگانەکانی تر دەکات کە هەر یەکەیان چۆن بێت بۆ ئەوەی بە یەکەوە کۆئەندامی خوێن دروست بکەن. لە بواری کۆمەڵایەتییشدا لەسەر هەمان پرەنسیپ دەڕوات. هەروەکو چۆن ئەوەی لە نێوانی دوو وایەر و پاترییەکدایە دەبێت گلۆپ بێت، ئاواش سەربازێک لە سوپایەکدا دەبێت جەنگاوەر بێت. گلۆپێک لە کارخانەیەکدا دروست دەکرێت، بەڵام مرۆڤ لە سەربازییدا دەکرێت بە جەنگاوەر و لە کارخانەی کۆمەڵایەتی خوێندنی پزیشکیی و پراکتیکدا دەبێت بە دکتۆر. ئەو سیستێمەی مرۆڤەکەی تێ دەکەوێت، وردە وردە مرۆڤەکە بەگوێرەی خۆی دەگۆڕێت. بۆیە لە ڕووی زانستییەوە سەیر نییە کە کاتێک سەرانی پارتەکانی خوارووی کوردستان سوپای داگیرکەر دەهێننە سەر کوردستان، ئەندامەکانیان سەرەڕای چەندەها قوربانییدان لە ناپاکیی نەتەوایەتییدا هەر لەگەڵ بن. سیستێمی دەسەڵاتی هێز و پارتەکان ئەندامەکانیان بە تایبەتی و خەڵکەکەیان بەگشتی بە شێوەیەک فۆرماندووە کە لە ناوەڕۆکدا و بە شێوەیەک لە شێوەکان گونجاو بن بۆ ئەو خراپانەی کە پێیان دەکەن یان لە ناویاندا دەکرێت. گلۆپێک کە سترەکتوورێکی تایبەتی وەر گرتووە و تەرخان بووە بۆ داگیرساندن، تێنەگەشتنی خۆمانە جگە لە داگیرسان چاوەڕێی فەنکشنێکی تری لێ بکەین. حیزب بێت یان تاکە مرۆڤ تەرخاوە بۆ ئەو کارانەی دەیان کات. هەڵەکە لە خۆتدایە کە چاوەڕێی نیشتیمانپەروەریی لە ڕێکخراوێک یان کەسێک دەکەیت کە یەکەمیان داردەستی داگیرکەران بێت و دووەمیان لایەنگری داردەستان.

## بەشی سێیەم

بەشی سێیەم بریتییە لە تێکەڵاوبوونی بەشی یەکەم و دووەم. واتە ئامرازەکانی تێگەشتن (بەشی دووەم) بەکار دەهێنم بۆ شیکردنەوەی بابەتەکە (بەشی یەکەم).

### ئاشبەتاڵ چۆن ڕوو دەدات؟

ساڵی ١٩٦٦، جەلالیی هاتە ناو حکومەتی عێراقەوە. ئەم هێزە بۆ ئەوەی ڕۆڵی شەڕکردن ببینێت، دەبێت لە فەنکشندا بێت (پێتێکی یەکەم). بۆ ئەوەی لە فەنکشندا بێت پێویستە لە هێڵێکی داخراودا بێت (پێتێکی دووەم). ئەم هێزە بە هاتنەناوحکومەتییەوە بوو بە یەکێک لە دامەزراوەکانی حکومەتی عێراق. حکومەت چەک و تەقەمەنی، پارە، ئازووقەو ئازادیی جوڵانەوەی دەدا بەم هێزە. ئەم ڕێکخراوە؛ ئەندامەکانی، کۆمیتەکانی، چەکدارەکانی، ئۆتۆمبیلەکانی، بەندیخانە و بڵاوکراوە و هەموو دامەزراوەکانی تری لە ئیشکردندا بوو. کاتێک حکومەتی عێراق لە گەڵ **مەلا مستەفا** ڕێک کەوت ئیتر ئیشی بەم هێزە نەما. ئەڵقە داخراوەکە کرایەوە. حکومەت دەستی نا بە پلاکەکەی خۆیداو ئەم هێزە لە فەنکشن کەوت و ڕۆڵی نەما.

کە جەلالیی ساڵی ١٩٦٦ هاتە ناو حکومەتەوە، مەلاییش وردە وردە لە کوردستانەوە خۆی بەستەوە بە ئێرانەوە. کورد خۆی چۆن ئەم جوڵانەوانەی بێتە بەرچاو و هیوای چی بێت پێیان ئەوە **هەڵەوێنەی** خۆیەتی، ئەگینا لە ڕاستییدا (مەلایی)یش هێزێکی ئێران بوو لە فۆرمێکی کوردییدا. مەبەستیشم لەوەی کە هێزێکی ئێران بوو ئەوەیە کە حکومەتی ئێران ئەم هێزەی خستبووە ئەڵقەی



وێنەی مەلا مستەفا و سەددام حسەین ڕۆژی: ١٩٧٠/٣/٢٠.

ستۆدیۆ ڕەفیق.




رێنەی سیمبۆلیی شێوەکانی ئاشبەتاڵ و چاوەڕوانیی داهاتوو.

**سترەکتووری رێکخراوەکانی باشووری کوردستان وایە کە لە هەموو کاتێکدا دەتوانرێت ئاشبەتاڵیان پێ بکرێت.**

---

خۆیەوە. فەنکشنی ئەم جوڵانەوە چەکدارییە لەناو هێڵێکی داخراوی حکومەتی ئێراندا بوو. هەر بۆیەش ئەو رۆڵەی کە ئەم هێزە دەیبینی رۆڵێک بوو کە بە گشتی و ناراستەوخۆ شای ئێران دەی گێڕا. بۆیە کاتێک کە رۆژی ١٩٧٥/٣/٦ حکومەتی ئێران لە جەزائیر لەگەڵ حکومەتی عێراقدا رێک کەوت، شای ئێران ئیشی بەم هێزە نەما. بۆیە دەستی نا بە پلاکەکەدا و توانی جوڵانەوەیەکی ١٤ساڵیی وەکو مەخفەرێکی خۆی بکوژێنێتەوە. مەلا مستەفاش دواتر لە ئێران رای گەیاند کە رۆڵی ئەو تەواو بوو. ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە لە دەرەوەی سیاسەتی ئێران سیاسەتێکی تری کوردیی نەبووە.

رۆژی ١٩٩٦/٨/٣١ هێزی پارتی و حکومەتی عێراق هاتنە سەر هەولێر و ئاڵای عێراقیان لە سەر خانووی پەرلەمانی حکومەتی کوردیی هەڵ کردەوە. دوای چەند رۆژێک هێزەکانی پارتی رووی کردە شارەکانی ترو هێزی یەکێتی نیشتیمانی لە ماوەی چەند رۆژێکدا تا سەرسنووری ئێران خۆی نەگرتەوە. بەوەی کە پارتی لەو سەرەوە لەگەڵ حکومەتی عێراقدا هات و یەکێتیش لەم سەرەوە بە دەستلێبەردانی ئێران کوردستانی چۆڵ کرد، کێشەی کورد لە رێگای حیزبەکانەوە بەتەواوی مانای سیاسی نەما، ئەو ناوچە پارێزراوەی کە ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی بە حساب بۆ پاراستنی خەڵکی کورد لە هێرشی سەددام حوسەین دای مەزراندبوو، داگیرکەرەکانی کوردستان بە کورد خۆی توانیان بیشکێنن. یەکێتی نیشتیمانی پاش ماوەیەک لە لایەن ئێرانەوە خرایەوە ئیش و لە ماوەیەکی کورتدا، هەولێری لێ دەرکەیت، شوێنەکانی خۆی گرتەوە.

**سەرئەنجام:**

ئەو رێکخراوانەی کە خۆیان دەبەستن بە وڵاتێکەوە دەبن بە دامەزراوێک لە ناو سترەکتووری دەسەڵاتی ئەو وڵاتەدا. بۆیە فەنکشنی ئەم رێکخراوانە دەبەسترێت بەو ئەڵقەیەوە کە ئەو وڵاتە رێکخراوەکەی پێ دەبەستێت بە خۆیەوە. بەم پێیە ئەو رۆڵەی ئەو رێکخراوە خۆبەستانە دەی بینین بەگشتی ئەو وڵاتە بەستێنەرەش بڕیاری لەسەر دەدات. هەر کاتێکیش ئەو وڵاتانە نیشیان بەو رێکخراوە بەسترارانە نەما ئەڵقەی بەستنەوەکە ئەبڕن و ئیتر جوڵانەوەکانیشیان فەنکشنیان نامێنێت. ئەم لەفەنکشنکەوتنەش حاڵەتێک دەخاتەوە کە خەڵکیی ناوی ناوە "ئاشبەتاڵ".

**ئاشبەتاڵ بۆ روو دەدات**

بیهێنەرە بەرچاوی خۆت تانکییەک، چەند بەلوعەیەکی لەسەرە. ئەم تانکییە بەردەوام لە رێگای بۆرییەکەوە پڕدەبێتەوە لە ئاو. گریمان ئەم بۆرییە دەشکێت. ئیتر ئەوەی روو دەدات بەتاڵ بوونەوەی تانکییەکەیە تا وشک دەکات. بەڵام ئەگەر ئەم تانکییە بۆرییەکی تریشی لەسەر بێت، رەنگە بە هەمان خێرایی پڕ نەبێتەوە، بەڵام وشک ناکات. ئەو هێزانە بۆیە ئاشبەتاڵ دەکەن، چونکە لە دەرەوەی ئەو رۆڵەی کە وڵاتە دەستێخەرەکانیان پێیان دەبینن هیچ رۆڵێکی تری کوردییان پێ نییە کە وڵاتەکە پشتی تێ کردن خۆیان لەسەری بەردەوام بن. راستە ئەم رێکخراو و هێزانە لەسەرتاوە لەناو میللەتەکەدا رەگوڕیشە دادەکوتن، بەڵام خۆبەستنەوەیان بە وڵاتانەوە وردە وردە لە میللەتیان دەبچڕێ و تا بە یارمەتی وڵاتان گەورەتر بن زیاتر لە دەستی ئەو وڵاتانەدا بچکۆلە دەبنەوە و دەتەرخێن بۆ رۆڵی ئەشبەتاڵ.

**شێوەکانی ئاشبەتاڵ**

هەموو شتێک لە دوو باری جیاوازدا بە دوو شێوە خۆی دەر دەبڕێت. ئاشبەتاڵیش شێوەکەی بە گوێرەی لایەنەکانی بەشدار و ئەو بار و سەردەمە دەگۆڕێت کە تیایدا روو دەدات. بۆیە کە باسی ئاشبەتاڵێک دەکەین چ لە رووی زانستی و چ لە رووی زمانەوانییەوە گرنگە هەر یەکەیان ناوی خۆی بە گوێرەی سیفەتێکی تایبەتی خۆی هەبێت. بۆیە ئاشبەتاڵی ساڵی (١٩٧٠)ی جەلالیم ناو بردووە بە "**بچڕانەوە**"، چونکە لە بچڕانەوەی تەزبیحێک دەچوو. ئاشبەتاڵی ساڵی (١٩٧٥)ی مەلاییم ناو بردووە بە "**بلاوەپێکردن**"، چونکە بلاوەیان بە خەڵکەکە کرد. ئاشبەتاڵی ساڵی (١٩٩٦)ی یەکێتییم ناو بردووە بە "**چۆڵکردن**"، چونکە ناوچەکانی خۆیان لەبەردەمی هێزی حکومەت و پارتییدا چۆڵ کرد.

شێوەکانی ئاشبەتاڵ ئاساییە جیاواز بێت، بەڵام دەبێت چەند کارەکتەرێکی دیاریکراو هەبێت بۆ ئەوەی کە سیفەتی ئاشبەتاڵیی بدات بەو حاڵەتەی کە ئەو رێکخراوە یان ئەو هێزەی تێ دەکەوێت. ئەو کارەکتەرانەی کە دەبێت لە حاڵەتێکدا ببینرێت بۆئەوەی بە گوێرەی ئەو پێتێگانەی پێشوو پێی بوترێت ئاشبەتاڵ ئەمانەی خوارەوەن:

**A- لەفەنکشنکەوتن و رۆڵنەمان.** ئاشبەتاڵ لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە هێزەکە لە فەنکشن دەکەوێت و رۆڵی نامێنێت. ئەم لەفەنکشنکەوتن و رۆڵنەمانەش رەوت نییە بەڵکو رووداوە. واتە، ئەنجامی رەوتی سروشتیی هێزەکە خۆی نییە کە وای لێ بکات رۆڵی مێژوویی نەمێنێت. بەڵکو رووداوێکە لە ئاکامی هۆیەکی تایبەتییەوە روو دەدات کە پێشتر باسم کردووە. هەر بۆیەش نوقتەی لەفەنکشنکەوتن، هێزەکە دەخاتە حاڵەتێکی ترەوە: هەڵوەشانەوە.

**B- هەڵوەشانەوە.** سترەکتووری ئەو هێزەی لە فەنکشندایە سیستیمی هێڵە داخراوەکە بڕیاری لەسەر دەدات. بەپێی ئەم پێتێگەیە، ئەو هێزانەی دەکەونە سیستیمی دەسەڵاتی وڵاتەدەستێخەرەکانەوە، ئەو سیستەمە وردە وردە دەیان فۆرمێنێت بۆ ئەو ئەرکەی کە پێیان دەبینێت. ئەم هێزانە دەگەنە پلەیەک کە هەر وەکو چۆن کلۆرێک تەرخان بووە بۆ سوتان، ئاواش ئەو هێزانە دەتەرخێن بۆ ئەو ئەرکەی کە پێیان دەبینن. لەم پلەی تەرخانبوونەدا هەر کاتێک ئەو ئەرکانە تەواو بوون کە هێزەکەی بۆ تەرخاوە، هێزەکە ئەرکێکی تری لە دەستدا نامێنێتەوە بۆی کۆ ببێتەوەو سەرئەنجام هەڵوەشانەوە روو دەدات. ئەم هەڵوەشانەوەیەش



کارەکتەری سەرەکی خۆی هەیە لەوانە:

١- **بێدەسەڵاتیی سەرهێزەکان**. ئاشبەتاڵ لەسەروو توانای هێزە ئاشبەتاڵکەرەکەوەیە. بچڕانەوەی جەلالیی ساڵی ١٩٧٠، بڵاوەپێکردنی ساڵی (١٩٧٥)ی مەلایی، کوردستانچۆڵکردنی یەکێتی ساڵی ١٩٩٦ و کەوتنەبەردەستی تورکیای عەبدوڵا ئۆجەلان، ئەمانە هیچیان لەبەر هۆی ژێرکاریی ئەو لایەنانە روویان نەداوە. سەرهێزەکان سەرپشکی هیچ بڕیارێکی تر نەبوون. بۆیە ئەم سەرهێزانە لەم رووداوانەدا هەڵەیە رەخنەیان لێ بگیرێت، دەبێت تێیان بگەیت. چونکە ئەلتەرناتیڤی تریان لە بەردەستدا نییە تا رەخنەی هەڵنەبژاردنی رێگایەکی تریان لێ بگیرێت. مەلا مستەفا بە خۆڕایی بە شای ئێران ناڵێت: "ئێمە میللەتی تۆین، بڵێی بمرە دەمرین، بڵێی بژین دەژین"(١). سرووشتی ئەم هێزانە وایە نە دەتوانن سەرکردەیەکی نەتەوەیی دروست بکەن، نە دەتوانن کورد بە مافەکانی بگەیەنن.

٢- **حەتمیبوون**. هەڵوەشانەوەکە رووداوێکی حەتمییە. بێدەسەڵاتیی سەرهێزەکان نیشاندەرێکی سرووشتی ئەم حاڵەتەیە. دەنگوباسێک باسی ئەوەی دەکرد کە دوای ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥، لایەن یان ژمارەیەک کەس هەبووە کە ویستوویەتی بەردەوامیی بدات بە جوڵانەوەکە. بەڵام ویست ناخوات و ناچێتە حسابەوە. ئەگەر بە ویست بێ ئەو سەرهێزانەش نەیان دەویست بەو دەردانە بچن. ئەوەی زانست دەیگرێتەوە کردارە. کرداریش کە بریتی بێت لەوەی ژمارەیەک لەناو جوڵانەوەیەکی ئاشبەتاڵپێکراودا بەردەوامیی بدات بەو جوڵانەوەیەی کە ئاشبەتاڵی پێ کراوە، کارێکی مەحاڵە. چونکە: بەشێک لە گشتێک ناتوانێت لە هەمان کاتدا بە پێچەوانەی جوڵانەوەی گشتەکەوە بجوڵێتەوە. فڕۆکەیەک کە بەردەبێتەوە، رێبوارەکانی ناویشی بە هەمان خێرایی، سەربەست لە ویستییان، لە گەڵ خۆیدا دەهێنێتە خوارەوە. مرۆڤێک لە سەرخەرێکدا کە دێتە خوارەوە، ناتوانێت لەهەمان کاتدا ئەو بچێت بۆ سەرەوە. بەشی هەر گشتێک هەڵگری حاڵەتی جوڵانەوەی گشتەکەیە.

٣- **بەربوونەوە**. گیانلەبەر توانای ئەوەی هەیە سەرئەنجام لە رووداو و جوڵانەوە را بکێشێت. بۆ نموونە، کۆترەشینکە لە سوید دەزانێت مرۆڤەکان پەلاماری نادەن. بەڵام کۆترەشینکە لای خۆمان بە قەرەی مرۆڤدا ناڕوات. ئەم سەرئەنجامە سرووشتیانە مشتەخەرمانی گرنگن بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەو بابەتانەی کە ئەو سەرئەنجامانەیان لێوە را دەکێشرێت. رەنگە هەر بۆیەش هەندێک لە فەیلەسوفەکان سەرچاوەی زانیاریی بگێڕنەوە بۆ تاقیکردنەوە. ئەو سەرئەنجامەی کە بە شێوەیەکی سرووشتی لە ئاشبەتاڵ را کێشراوە "هەرەس"ە. ئەم زاراوەیە دوو راستیی تیادا کۆ بۆتەوە. یەکەم بێدەسەڵاتیی سەرهێز، دووەم روخان. شتێک کە هەرەس بێنێت دیارە دەبێت لە خاڵێکی بەرزترەوە داڕمێت بۆ خاڵێکی نزمتر. کاتێک کە هێزێک ئاشبەتاڵی لێ دەکات، مرۆڤەکان لە رووی فیزیکییەوە پێش ئاشبەتاڵ و دوای ئاشبەتاڵ هەر بەقەدەر درێژیی خۆیان بەرزن لە زەوییەوە. بەڵام ئەوەی کە دەڕوخێت ئەو رێکخستنە کۆمەڵایەتییەیە کە بەرزبوونەوە تیایدا بە پێی مەترەی دەسەڵاتە. ئەم هەڵوەشانەوەیە کە لە گەڵ بەربوونەوەدا رووخان دەگرێتەوە، جیاوازە لە هەڵوەشانەوەی بێ بەربوونەوەی پەرلەمانێک، حکومەتێک یان هەر دەسەڵاتێکی تر، کە ماوەی حوکمی یا خود رەوایی لە دەست دەدا و بڕیاری هەڵوەشانەوەی دەدرێت.

٤- **ماوەی خایاندن**. فاکتەرێکی تر لەم پرۆسێسەدا کاتە. بەردێک کە لە نوقتەیەکەوە بەر دەبێتەوە یەکەم ماوەیەک دەخایەنێت تا دەگاتە زەوی، دووەم لەم ماوەی کەوتنە خوارەوەیەدا لە حاڵەتێکی تایبەتی جوڵانەوەدایە. هێزێکیش کە بە هۆی ئاشبەتاڵەوە هەرەس دێنێت، دەکەوێتە حاڵەتێکی رووخانی تایبەتی خۆیەوە لەم حاڵەتەدا زەحمەتە مرۆڤەکانی تا ماوەی بەربوونەوەکە تەواو نەکەن و نەگەنەوە زەوی بتوانن کارێک بکەن و هەڵ بسنەوە، چونکە کاتێک پرۆسێسەکە ئاشبەتاڵە، شتێک ناکرێت پرۆسێسەکانی ئاشبەتاڵ رێگای پێ نەدەن. رێکخستن لە هەڵوەشاندنا ناکرێت ئەم حاڵەتەی باسم کرد لەو بڕوایەدام لە شکانی سەربازیی هێزێکیشدا ببینرێت. کاتێک هێزێک دەشکێت تووشی هەڵوەشان و بەربوونەوەیەک دەبێت، کە ماوەیەکی دەوێت تا لە رووی رۆحیی و رێکخستنەوە بێتەوە سەر پێی خۆی. رەچاوکردن و بەئاگایی لە ماوەی *بەربوونەوەی هەڵوەشان*، گرنگە بۆ ئەوەی بزانیت ئیشێک لە کاتی خۆیدا بکەیت. ئەو ئاشبەتاڵانەی بەسەر گەلی کوردا هاتوون، کاریگەریی قورسییان لە هەناوی میللەتەکەدا بێ تیمار بەجێ هێشتووە. جگە لەوەی کە ماتەمینیی لە دڵی خەڵکەکەدا دروست دەکەن، شوێنەواری دەروونیی و کۆمەڵایەتیی و کولتووریش بەجێ دێڵن کە لێکۆڵینەوە و گەڕانی زۆر بە دوایاندا هەڵ دەگرێت. بەڵام ئایا کێ بەم کارانە هەڵسێت؟

**سەرچاوە:**

١- ژمارەی رۆژی (٢٢/١٠/٩٨) رۆژنامەی دی ئێن.(DN)ی سویدیی.

٢- ل: ٨، ١٧، ١٠٤، ١٣٢، الحزب الديموقراتي الكردستاني/ اللجنه التحضيريه، تقييم مسيره الحركه الكرديه وانهيارها والدرس والعبر المستخلصه منها.

**فەرهەنگۆک**

لەو هەولانەدا کە داومن هەندێک زاراوە دروست بووە، کە لەم باسە و لە داهاتووشدا بەکاریان دەهێنم، گرنگە کە ناوەڕۆکەکانیان روون بکەمەوە.

**رووتێکردنی سیاسی**: کاتێک کە جەماوەر روو دەکاتە رێکخراوێک یان کێشەیەکی سیاسی. پارتێک دەتوانێت بیر لەوە بکاتەوە چی بکات باشە بۆ ئەوەی رووتێکردنی سیاسی بەدەست بهێنێت. یان چۆن کێشەیەکی بۆ نموونە وەکو ئەنفال، دەرهێنانەوەی مین، داڕووندان و سەربەستی بکەوێتە رووتێکردنی سیاسییەوە. پێچەوانەکەی "کشانەوەی سیاسییە". رێکخراوێک تووشی کشانەوەی سیاسی دەبێت.

**پێتیگ**: ئەو بنەڕەتەیە کە پێی لە شتێک دەگەیت. پێتیگ ئەو سەرچاوەیەیە کە تێگەشتن لە شتێکی بۆ دەگێڕیتەوە. بۆ نموونە، لە ئیسلامدا لەگەڵنووستنی بێمارەیی خراپەیە. ئەم تێگەشتنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێتیگەی کە سێکسی ناحەلاڵ "زینایە" و زیناش گوناحی گەورەیە. یاخود کاتێک ڕێکخراوێک هەڵ دەوەشێت، لەناو ئەم ڕێکخراوە هەڵوەشاوەداو لە کاتی پرۆسێسی هەڵوەشاندا، ڕێکخستن مەحاڵە. ئەم تێگەشتنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێتیگەی کە بەش هەڵگری حاڵەتی جوڵانەوەی گشتە.

**تەرخاو**: هەر شتێک کە بە شێوەیەکی سەرەکی تەرخان بووبێت بۆ ئەرکێک. بۆ نموونە: دڵ بۆ لێدان، قوتابخانە بۆ فێرکردن، فابریکێک بۆ دروستکردنی تەلەفون، پارتێک بۆ دیموکراتی، مرۆڤێک بۆ پزیشکیی، مریشکێک بۆ هێلکە ئەوی تر بۆ گۆشت.

**ڕێکخراوی خۆبەست**: ئەو ڕێکخراوەیە کە خۆی دەبەستێت بە هێزێکی گەورەترەوە، وڵات بێت یان ڕێکخراوێکی تر. هێزە گەورەکەش لە ڕێگای خۆبەستنی ئەوەوە دەست دەخاتە هێزە بچوکترەکەوە و لە نوقتەیەکی دیاریکراودا ئیتر دەتوانێت بیهێنێ و بیبات.

**هەڵەوێنە**: ئەوەیە کە وێنەیەک بۆ کەسێک یان کێشەیەک لای خۆت دروست بکەیت کە ئەو وێنەیە دوور بێت لە ڕاستی ئەو کەسە یان ئەو کێشەیەوە (بۆ زیاتر زانین تەماشای ژمارەی پێشوو بکە)

---

# ڕواندنی ٥٠٠٠ دار لە هەڵەبجە

**پڕۆژەی "پارکی شەهیدانی هەڵەبجە"ی "کۆمەڵەی ژینگەی کوردستان"ە** لە سلێمانی. ئەم کۆمەڵەیە کە تازە دروستبوون، بەپێی ئەو نامەیەی کە لە "دۆستانی ژینگەی کوردستان"ەوە لە سوید، بۆ گۆڤاری **کۆنتراکت** هاتووە، لە هەڵەبجە جێگایەک ئامادە کراوە بۆ ڕواندنی ٥٠٠٠ دار. بە سەرپەرشتی دوو ئەندازیاری کشتوکاڵی: **نورەدین عەبدولڕەحمان و نەجمەدین عومەر مەحمود** و بە یارمەتی کرێکارەکانی بەڕێوەبەرایەتی نزاری هەڵەبجە، ئەو ئیشانەی کە پێش چاندن پێویستە بکرێن وەکو لێدانی هێڵی دراگۆنی، دروستکردنی پەرژین و هەڵکەندنی بیری ئاو، ئەنجام دراون.

دۆستانی ژینگەی کوردستان داوا لە هەر یەکێک دەکەن دارێک، کە بە ٢٠کرۆنە، بۆ نەمریی شەهیدەکان بکڕێت. با باسی خراپەی تاوانکاران توانای ئیشکردنیشمان لێ نەسەنێتەوە. کە پڕۆژەیەکی باشیش لەم دنیا سەختەدا سەری دەرهێنا، دەستی پێوە بگرین، نەیەڵین بکوژێتەوە.

با هەر کەس دارێک بڕوێنێت، بەڵام ئەگەر دارەکەیان سوتاندی نەڵێیت: "ئەمە یەکەم جار نییە دار دەسوتێت". ئەگەر دارەکەتیان بڕییەوە نەڵێیت: "ئەمە یەکەم جار نییە دار دەکوژرێت". دەست



بگریت بەو دارەوە کە دەیڕوێنیت، بۆ تۆش لق دەردەکا و بۆ تۆش ڕەگ دادەکوتێت، هەر دارەکە سەوز نابێت، تۆش.

بۆ زیاتر زانیاریی دەتوانن پەیوەندی بکەن بەم ناوانەوە: **شادمان**، ژمارەی تەلەفون: 0739700989 هەروەها: **نیان حەسەن**، ژمارەی تەلەفون: 08-898371 . ژمارەی پۆستجیرۆ: 621985-1

---

# هەموو دەسەڵاتێک دەبێت لەگەڵ ئەو گفتەدا لاچێت کە نایباتە سەر

**پرسیار**: بۆ؟

**وەڵام**: **ژمارەکانی داهاتوو**

# چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی

(1994)دا، فڕۆکەی باری سودانی لە بەشێکی فڕۆکەخانەی سەدامی ئێنتەرناشناڵی دەنیشتنەوە و سنووقی گەورەیان باردەکرد و دەچوون بۆ سوودان. زۆربەی چەکپشکنەرەکان ئەم فڕۆکانەیان دەبینی، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە بەشێکی فڕۆکەخانەکە دەنیشتنەوە کە بریتی بوو لە یەکێک لەو جێگایانەی کە بە شوێنی تایبەتی سەددام (شوێنەکانی سەرەککۆمار ) ناسرابوو و ئەندامانی (UNSCOM) بۆیان نەبوو بیپشکنن. ئەو فڕۆکانە لە ماوەی چەند ساڵێکدا، گەلێک چەک و دۆکومێنتیان دەربارەی پرۆگرامی چەکی زۆرەکوژی عێراقی لە چنگی یونوکۆم دەربازکرد. گواستنەوەی ئەو شتانە بۆ سودان لەلایەن پیاوانی رژێمی عێراقییەوە دەکراو تەنانەت فڕۆکەکانیش لەلایەن فڕۆکەوانی عێراقییەوە لێ دەخوڕران. تەنیا وەڵامی پیاوانی رژێمی عێراقی دەربارەی ئەو فڕۆکانە و بارەکانیان ئەوەبوو کە ئەو فڕۆکانە خواردن و کەلوپەلی پێویست دەبەن بۆ سودان بۆ یارمەتیدانی خەڵکە هەژارەکەی. جیم ساکسۆن (Jim Saxson)ی ئەندامی لیژنەی ئەمریکی دژی تیرۆریست وتی: "سەرەڕای ئەو هەموو بۆمبارانکردن و پشکنینە، پێم وایە کە چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی عێراق هیچیان لێ نەهاتووە چونکە ئەو چەکانە لە عێراقدا نەمابوون، زووربەیان نێردرابوون بۆ سودان." رژێمی عێراقی چەندجار چەکی کیمیایی دژی کورد بەکارهێناوە و گەلێک دێی کوردستانی پێ کاول کردووە. کیمیابارانی هەڵەبجە یەکێک بوو لەو کارانەی رژێم. نە ئەمڕۆ و نە لەداهاتووشدا میللەتی کورد ناتوانێت دڵنیا بێت لەوەی کە رژێمی عێراقی ئێستا وەیان رژێمی وڵاتە داگیرکەرەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستان، ئەو چەکانە دژی بەکارناهێننەوە. بۆیە زۆر پێویستە کە ئاگادارییەکی باشی هەبێت دەربارەی ئەم چەکانەو هەوڵ بدات کە وەکو جوولەکەکان خۆی ئامادەبکات بۆ خۆپاراستن لێیان. زانیاری یەکەم هەنگاوە بەرەو ئەو خۆپارستنە.

چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی، کە بە چەکی بەکۆمەڵکوژی پیاوی هەژار ناسراون، جیاواز لە چەکی ئەتۆمی، دروستکردن و شاردنەوە و بەکارهێنانی تا رادەیەکی زۆر ئاسانە. وا لەخوارەوە زۆر بەکورتی باسی کوشندەترین چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی دەکەین.

**کورد ناتوانێت دڵنیا بێت لە رژێمەکانی داهاتوو**



لە رۆژی (1998/11/8)دا، بەرنامەی ئۆتتا داگار (Åtta dagar)ی سویدی ریپۆرتاژێکی دەربارەی چەکە زۆرەکوژییەکانی عێراق بڵاوکردەوە. بەپێی ئەو ریپۆرتاژە، لەنێوان ساڵانی (1991) و (1994)دا، رژێمی عێراقی زۆربەی چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییەکان و دۆکومێنتەکانیانی ناردووە بۆ سودان بۆ ئەوەی کە لە چنگی چەکپشکنەرەکانی (UNSCOM) دەربازیان بکات. ئیوان بوکانون (Ewan Buchanan)ی ئەندامی لیژنەی ئەمریکی دژی تیرۆسیست ووتی: "ئێمە دەزانین کە عێراق چەکی کیمیاییو بایۆلۆجی هەبوو، بەڵام ئێستا نازانین ئەو چەکانە لە کوێن و چیان لێهاتووە". جاک ئومس (Jack Ooms) کە راوێژێکراوێکی تایبەتی بوو لە (UN) و لە نێوان ساڵانی (1991) و (1996)دا لەگەڵ گرووپی چەکپشکنەرەکانی (UN) کاری کردووە ووتی، کە عێراق زیاتر لە هەزار کەسی تەرخان کردبوو بۆ رێ لێونکردنی چەکپشکنەرەکان و شاردنەوە و گواستنەوەی چەکەکان و دۆکومێنتەکانیان. بەپێی قسەکانی جاک ئومس، لەنێوان ساڵانی (1991) و

# چەکی کیمیایی

## ڤی ئێکس (VX)

چییە: ڤی ئێکس، کە بە کوشندەترین چەکی کیمیایی ناسراوە، بریتییە لە شلەیەکی بێ بۆنی بێ ڕەنگ، کە بە بەرکەوتنی لەگەڵ ئۆکسجین (هەوا)دا دەبێت بە گاز.
چۆن کار دەکات: ڤی ئێکس بە بەرپێستکەوتن مرۆڤ ژەهراوی دەکات، بەڵام هەڵمژینیشی کوشندەیە. بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکرێت، ڤی ئێکس زۆر بەخێرایی بەهەوا و ئاو بڵاودەبێتەوە. لەدۆخی شلیدا، چڕیی ڤی ئێکس وەک چڕیی ئاوە. ڤی ئێکس ڕێ لە تەزووی دەمارەکان دەگرێت و کۆئەندامی دەمار لەکار دەخات، هەناسەدان دەوەستێنێ و دەبێتە هۆی مردن.
میقداری کوشندە: 10 میللیگرام (تەنیا یەک دڵۆپ بەسە بۆئەوەی مرۆڤێک بکوژێت).
نیشانەکانی: لیکهاتنەخوارەوە، کۆکە، ئاو بەلووتدا هاتنەخوارەوە، سەرئێشە و گێژیی.
خۆپاراستن: دەمامکی گاز، جلوبەرگی تایبەتی.

## گازی ماستەرد (MASTARD GAS)

چییە: گازی ماستەرد بەپووختی، شلەیەکی بێ بۆنی بێ ڕەنگە، بەڵام کاتێک لەگەڵ ماددەی کیمیایی دیکەدا تێکەڵ دەکرێت ڕەنگەکەی دەبێت بەقاوەیی و بۆنی سیر دەگرێت.
چۆن کاردەکات: بەهەڵمژینی هەڵمەکەی دەبێتە هۆی درووستبوونی بڵق لەهەموو لەشدا. ئەم بڵقانە ئازارێکی زۆریان لێ دێت و ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە.
نیشانەکانی: پێستخوران، ئاو بەچاودا هاتنەخوارەوە و سووتانەوەی سییەکان. کاریگەریی ئەم گازە درێژخایەنە و دەبێتە هۆی بەناتەواوی کارکردنی سییەکان، سنگئێشان و سەرەتانی دەم وقورگ و بۆری هەواو پێست. ئەم گازە بەهۆی لیۆکیمیا (سەرەتانی خوێن) و سەقەتیی منداڵ دادەنرێت.
خۆپاراستن: دەمامک.

## سارین (SARIN)

چییە: سارین گازێکی زۆر ژەهراوییە کە کاردەکاتە سەر کۆئەندامی دەمار.
چۆن کاردەکات: گازی سارین بەشێوەیەکی گشتیی لەڕێگای بۆری هەواوە هەڵدەمژرێت. لە شوێنی گەرمدا لەڕێگای پێستیشەوە هەڵدەمژرێت. ئەگەر خەستییەکەی زۆر بێت گازی سارین لە ماوەی چەند چرکەیەکدا مرۆڤ ژەهراوی دەکات.
میقداری کوشندە: سەد میللیگرام (سەدبەش لە هەزار بەشی گرامێک).
نیشانەکانی: بەچڕیی کەم، گازی سارین دەبێتە هۆی سەرئێشەیەکی زۆر و لیکهاتنەخوارەوە و تەسکبوونەوەی بۆری هەوا. بەچڕیی زۆر دەبێتە هۆی کۆکین، ئارەقکردنەوە، گێژبوون، ڕشانەوە، سکچوون و بەزەحمەت هەناسەدان و خنکان.
خۆپاراستن: دەمامک.

# چەکی بایۆلۆجی

## ئەنسراکس (ANTHRAX)

چییە؟: بەکتریایەکە کە سپۆر درووست دەکات و لە خۆڵدا دەژی.
چۆن کاردەکات؟: مرۆڤ بە هەڵمژینی سپۆرەکە یان بەوەی بەرپێستی بکەوێت تووش دەبێت. سپۆرەکان ژەهرێکی کوشندە دەردەدەن. ماوەی تووشکردن لەڕێی هەناسەوە یەک تا شەش ڕۆژە.
میقداری کوشندە: یەک لەملیاردێکی گرامێک (بەقەدەر دەنکە تۆزێک).
چەند دەژی؟: ئەم سپۆرە بە تیشکی خۆر بەخێرایی شی دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بارودۆخی گونجاوی بۆ بڕەخسێت، ئەوا بۆ چەندساڵێک دەژی.
نیشانەکانی: وەکو نیشانەکانی هەڵامەت وایە؛ تایەکی قورس، بێهێزیی و کۆکە. لەماوەی (24) بۆ (36) سەعاتدا دەبێتە هۆی تاساندن و مردن.
چارەسەرکردنی: ئەنتیبایۆتیک کە پەنسلینی تێدابێت.
خۆپاراستن: خۆکوتان.

## ژەهری بۆتۆلینۆم (BOTULINUM TOXIN)

چییە؟: جۆرە بەکتریاییەکە کە بە نەبوونی ئۆکسجین درووست دەبێت.
چۆن کاردەکات؟: لەڕێگای هەناسەوە. ژەهری بۆتۆلینۆم لەماوەیەکی کورت (چەند سەعاتێک یان چەند ڕۆژێک)دا بەوە مرۆڤ دەکوژێت کە کۆئەندامی هەناسەی لەکاردەخات. مرۆڤەکە ڕەنگە لەماوەی (24) تا (72) سەعاتدا هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی تێدا نەبینرێت. ژەهرەکە ڕێگا لەو کارلێکە بایۆکیمیاییانە دەگرێت کە ماسوولکەکانی کۆئەندامی هەناسە چالاک دەکات و بەو شێوەیە مرۆڤەکە دەخنکێت.
میقداری کوشندە: یەک لەملیاردێکی گرامێک.
چەند دەژی؟: پاش بڵاوکردنەوەی، ماوەیەکی کورت دەژی.
نیشانەکانی: گێژیی، وشکیی قوڕگ و لێڵبینین.
چارەسەرکردن: دژە ژەهر بدرێت بە نەخۆشەکە ماوەیەکی کورت دوای تووشبوونی.
خۆپاراستن: دەمامک و جلوبەرگی تایبەتی.

سەرچاوە: http://cnn/SPECIALS/1998/iraq/9802/weapons.effects/index.html

## کریستین گۆسدن

کریستین گۆسدن یەکەم دکتۆری ئەوروپییە کە سەربەخۆ لەگەڵ گروپێکی تەلەفیزۆنییدا چۆتە هەڵەبجە و فلیمێکی دەربارەی قوربانییەکانی چەکی کیمیاویی لە هەڵەبجە گرتووە بۆ ئەوەی ڕای جیهان بەرامبەر بەو خەڵکە ڕابکێشێت. بۆ ژمارەی داهاتوو هەوڵ دەدەین چاوپێکەوتنێک لەگەڵ دکتۆر گۆسدن دا بڵاوبکەینەوە.

# سەرەتاکانی ڕۆژنامەگەری کوردیی لە کوردستانی باشووردا

جەمال خەزنەدار

- ئینگلیزەکان هەر لە (١٩١٧/٣/١١)ەوە نەخشەی دامەزراندنی دەزگای ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەیان بە کوردی هەبوو
- دوای شەڕی بازیان، ئینگلیزەکان دەزگاکەیان گواستەوە بۆ سلێمانی و هەفتەنامەی "پێشکەوتن"یان دەرکرد
- دەسەڵاتی دووەمی کورد، "پێشکەوتن"ی ڕاگرت و "بانگی کوردستان" دەرکرا
- ڕۆژنامەی "بانگی حەق" لە ئەشکەوتی جاسەنە دەردەچوو
- لە (١٩٢٤/٧/١٨)دا، داگیرکەر ڕۆژنامەی "ژیانەوە"ی دامەزراند
- ئەو بزافە ڕۆژنامەگەرییەی لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی شێخ مەحمودا دەستی پێ کرد، خۆی لە پایتەختی میر محەمەدی ڕەواندزیی دۆزییەوە

ئەگەر ڕۆژی (٢٢)ی نیشاتی ساڵی ١٨٩٨ بە سەرەتای دەستپێکردنی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی دابنێین، ئەو کاتە بۆمان هەیە (٨)ی شوباتی ساڵی ١٩١٤ بە سەرەتای دەستپێکردنی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە باشووری کوردستان بژمێرین(١). لە ڕۆژی (٨)ی شوباتی ئەو ساڵەدا ڕۆشنبیرێکی خەمخۆری کورد، قەڵەمی هەڵبڕی بۆ ئەوەی وەڵامی تورکە فاشستەکانی ئیتیحادی تەرەقی بداتەوە و بڵێ:-

ئەگەر ئێوە، گەرەکتانە لە کوردسانی باکووردا، دەنگی ڕۆشنبیرانی کورد بە داخستنی گۆڤاری «ڕۆژی کورد ١٩١٣»(٢) و گۆڤاری «یەکبوون ١٩١٣» و گۆڤاری «هەتاوی کورد ١٩١٣» کپ بکەن ئەوا لێرەدا گۆڤاری «بانگی کورد»یان بۆ بڵاو دەکەینەوە و بەرگرییان لێ دەکەین و پەیمانیان بۆ نوێ دەکەینەوە کە تا دوا تنۆک بۆ وەدەستهێنانی مافی ڕەوای کورد کۆڵنەدەین و سوور بین لەسەر پەیمان و عەهد، لەسەر هەمان ڕێچکەی یەکەمین قوتابخانەی ڕۆژنامەگەریی کوردی و ئاڵا بەرز دەکەینەوە و لەسەری دەڕۆین.

ئەم ڕۆژنامەنووسە کوردە، ناوی جەمالی کوڕی ڕەشیدی کوڕی عەبدوڵڵا بەگی کوڕی خالید پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای بابان بوو. لەو ساڵەدا قوتابی قوتابخانەی ماف (حقوق) بوو. لە بەغداد، چەند ژمارەیەک لە گۆڤاری «بانگی کورد»ی دەرکرد. هەرچەندە کێشە لەسەر ئەمە زۆرە کە چەند ژمارەی لێدەرچووە و لە چ ڕۆژ و ساڵێکدا دەرچووە؟ بەڵام گومان لەوەدا نییە کە سێ ژمارە بینراوە. ژمارە (١)ی لە (٨)ی شوباتی ساڵی ١٩١٤ بە ٢٤ لاپەڕەی قەوارە (٢٢ بە ١٦سم) لە چاپخانەی «الاداب» لە بەغدا چاپکراوە. پاش ئەوەی خاوەنی گۆڤار قوتابخانەی مافی بەغدادی تەواو کردووە کراوە بە ئەفسەر و گۆڤارەکەی وەستاوە و یەکێ کەوتووە. هەروەها

لە شەڕی بەرگری کردنی بەغداد لە ئاداری ساڵی ١٩١٧ بەشداری کردووە دژی ئینگلیزەکان.

هەر لە ڕۆژی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩١٧)ەوە، کە ئینگلیزەکان بەغدادیان داگیرکرد و پاشان چوون بەرەو کوردستان، بەرەو سامانی نەوت و سامانە سرووشتیەکانی کوردستان. هەر لەو ڕۆژەوە نەخشە و پلانێکی بەدیقەت و دیاریان دەستنیشانکردبوو و بیریان لەوە کردبووەوە کە دەزگایەکی چاپەمەنی و ڕاگەیاندن و پڕۆپاگەندەی تایبەت بە زمانی کوردی پێویستە و کاتی خۆیەتی دایبمەزرێنن. ئەم پڕۆژەیەیان لە شاری بەغداد بە ئەنجام گەیاند و ڕۆژنامەیەکی کوردی هەفتانەیان بە ناوی «تێگەیشتنی ڕاستی»یەوە دامەزراند و دەرخست. ژمارە (١)ی لە ڕۆژی سێشەمەی ڕێکەوتی (١)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٨ بە چوار لاپەڕەی قەوارەی (٢١,٥ بە ٣٤سم) و تێکست (١٧ بە ٢٨سم) و ٦٧ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە(٣).

ڕۆژنامەی **تێگەیشتنی ڕاستی** (١٩١٨-١٩٢٠) و ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی پاش ئەو و پێش ئەو دەرچوون، دەتوانین بە سەرچاوەیەکی هەرە گرینگی مێژووی هاوچەرخی کوردی بژمێرین. هەروەها ئەگەر بە وردی ناوەڕۆکەکانیان بخەینە بەر نەشتەری لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە لە ڕوانگەی مافی ڕەوای میللەتی کوردەوە، ئەو کاتە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئینگلیزەکان چەند بە گومانەوە دەیانویست دان بە مافی کورددا بنێن و مافی ڕەوای کورد بەو جۆرەی خۆیان گەرەکیانە بە خەڵکی دنیا بناسێنن.

لە ساڵی (١٩١٩)دا ئینگلیزەکان لە هەموو ناوچەکانی عێراق و کوردستان سەرژمێرییەکی گشتییان سازدا. شاری سلێمانییان نەخستە ژێر ئەو سەرژمێرییەوە، بۆ ئەوەی عەرەب و

بانگ حق ‏ ‏ صحيفه ١

# بانگ حق

اعلانات بە دریك ٣ آنە سینتیت
تاریخ تأسیسی ٢٨ مارت ١٣٣٩
بو موشتبك مراجعت بە قرارگاهی عمومی دكریت

ئاشكی بە طوپ و بوبا سر افرازە بانگ حق.
سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، غزەتیكی رسمیە لە قرارگاهی عمومی اردوی كوردستان طبع دكری
غایە و ئاملی استحصالی حقوق كوردانە

سال ١ ‏ ‏ ژمارە ١ ‏ ‏ پنجشمبە ‏ ‏ ٢٨ مارت ١٣٣٩ ‏ ‏ ١١ شعبان ١٣٤١

تورک و فارس بە مافی ڕەوای کورد بترسێن. لەو ساڵانەدا شێخ مەحموود ئیدارەی کوردستانی گرتە دەست. ئینگلیزەکان مەترسییان پەیداکرد و هەوڵ و تەقەلای بێ وچانیان دەدا بۆ نانەوەی دووبەرەکی لە نێوان سەرکردەکانی کورددا و توانیان دووبەرەکی بخەنە ناو چینەکانی کوردەوە. کاتێک کە شێخ مەحموود لە شەڕەکەی دەربەندی بازیان شکستی هێنا و بە دیل گیرا و ڕەوانەی کوێت و هیندستان کرا، ئینگلیزەکان شاری سلێمانیان داگیرکرد و چوونە ناوی. دەزگای ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەی زمانی کوردییان لە بەغدادەوە گواستەوە شار و چاپ و چاپەمەنیان دامەزراند بۆ بڵاوکردنەوەی بەیاننامە و پێویستییەکانی خۆیان بە زمانی کوردی. ڕۆژنامەیەکی هەفتانەیان بە ناوی «**پێشکەوتن**»(٤) بڵاوکردەوە. ژمارەی (١)ی لە (٢٩)ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ لە ٤ لاپەڕەدا بڵاوکردەوە. ئەم ڕۆژنامەیە، کە ڕۆژنامەیەکی سیاسی و ئەدەبی و زانیاری و کۆمەڵایەتی بوو، ١١٨ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە. دوا ژمارە (٢٧)ی تەمووزی ساڵی ١٩٢٢ دەرچوو.

پاش دامەزراندنی دەسەڵاتی نەتەوایەتی کورد لە شاری سلێمانی بۆ جاری دووەم، ڕۆژنامەی «پێشکەوتن»ی ئینگلیزەکان وەستێنرا. ڕۆژنامەی «**بانگی کوردستان**»(٥) وەک ئۆرگانی کۆمەڵەی کوردستان لە شاری سلێمانی بۆ جاری یەکەم کەوتە کار. ژمارە (١)ی لە ڕۆژی (١٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ بە ٦ لاپەڕەی قەوارە (٢١,٥ بە ٣٤) دەرچوو. خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر و بەڕێوەبەری ئەو ڕۆژنامەیە **مستەفا پاشای یامولکی** بوو، مامۆستایان **شێخ نووری شێخ ساڵحی** شاعیر و ڕۆژنامەنووس، **ڕەفیق حیلمی** شاعیر و مێژوونووس و **عەلی کەمال باپیرئاغای** شاعیر نووسەری ئەم ڕۆژنامەیە بوون. دوا ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە (٨)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٣ دەرچوو. پاشان لە (٢٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٦تا (١)ی نیسانی ساڵی ١٩٢٦، سێ ژمارەی تری بە قەوارەی ڕۆژنامەی ئاسایی (گەورە) لە شاری بەغدا دەرچوو.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢، کە کابینەی حکوومەتی کوردستان دامەزرا، مستەفا پاشای یامولکی بوو بە وەزیری مەعاریف. بەپێی ئەوە کراوە و بە پێویست زانراوە کە خاوەنی بەرپرسیاری ڕۆژنامەکە بگۆڕێ و لە هەمان کاتدا بوونی ڕۆژنامەیەکی ڕەسمی ئۆرگانی حکوومەت پێویست بووە. لەبەرئەوە ڕۆژنامەی «**ڕۆژی کوردستان**» دامەزرا و ئیمتیاز و بەرپرسیاری درایە شێخ نووری شێخ ساڵح(٦). ژمارە (١)ی لە (١٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢)دا بە ٤ لاپەڕەی قەوارە (٢١,٥ بە ٢٤سم) بڵاوکرایەوە. ڕۆژی کوردستان ١٥ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە، دوا ژمارەی لە (١٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٣)دا بوو.

شێخ مەحموود بۆ جارێکی دی سلێمانی بەجێهێشت و چوونە شاخ بۆ خۆڕێکخستن و خۆئامادەکردن و کۆششی جۆربەجۆری دژی دوژمنانی کورد. لە ئەشکەوتی جاسەنەی نزیک سوورداش، بزووتنەوەی چەکداری کوردستان ڕۆژنامەی «**بانگی هەق**»ی بە ناوی ئۆرگانی «قەرارگاهی عمومی ئۆردووی کوردستان»ەوە دەرکرد. ژمارەی (١)ی لە ڕۆژی پێنجشەممەی (٢٨)ی مارتی ساڵی ١٩٢٣ بە دوو لاپەڕەی قەوارە (٢١ بە ٢٣) بڵاوکرایەوە. ناوەڕۆکی ئەم ژمارەیە بریتییە تەنیا لە یەک بانگهێشتنی ئاگاداریی لە «باش قوماندان و مەلیکی کوردستان مەحموود»ەوە. ئەم بانگهێشتنە لە حەوت خاڵدا ڕوونکراوەتەوە. پوختەی ئەو خاڵانە ئەوەیە کە ئینگلیزەکان نیەتیان بەرامبەر بە مافی کورد باش نییە و لە بەرژەوەندەی میللەتی کورد ناگەڕێن. هەروەها میللەت ئاگادار و هوشیار دەکەنەوە لەو کەسانەی درۆ و دەلەسە و دووبەرەکی لەنێو خەڵکیدا بڵاودەکەنەوە و داوا لە میللەت دەکەن ببن بە یەک دەست لەگەڵ پێشمەرگەکانی ئۆردووگای کوردستان و بە دوای موخالیفینی بەرژەوەندی میللەتدا بگەڕێن و بیاندەنە بەر یاسای دادوەریی.

ژمارە (٣)ی ڕۆژنامەی «**بانگی هەق**» لە ڕۆژی پێنجشەممەی (١٢)ی نیسانی ساڵی ١٩٢٣، هەر بە دوو لاپەڕەی هەمان قەوارە دەرچووە. وا دیارە ژمارە (٢)یش هەر بە دەستنووسی ماوەتەوە و هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ نییە لە ئەوەی **ئەدمۆنس** بەولاوە کە لە وتارێکیدا بڵاوی کردۆتەوە و دکتۆر کەمال فوئادیش دەستی بۆ ئەم ڕاستییە درێژ کردووە(٧). ئەدمۆنس تەواوی ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیە و ڕۆژنامەی «ڕۆژی کوردستان»ی داوە بە کتێبخانەی زانکۆی کامبریج(٨).

هەر لەو کاتەی کە **شێخ مەحموود** شاری سلێمانی بەجێهێشت و ڕووی کردە شاخ و ئەو دوو ژمارەی ڕۆژنامەی «بانگی هەق»بە ناوی ئۆرگانی شۆڕشی کوردستان دەرکرد، کۆمەڵێک لە نووسەران و ڕۆشنبیران لە سلێمانی ڕۆژنامەی «ئومێدی ئیستیقلال»یان دامەزراند. ئەم ڕۆژنامەیە ژمارە (١)ی لە (٢٠)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٢٣)دا دەرچوو. لە سەرەتا **خواجە ئەفەندیزادە** مودیری مەسئوولی بوو، پاشان ڕەفیق حیلمی بووە سەرنووسەر و **ئەحمەد خواجەش** یەکێک بوو لە نووسەرە چالاکەکانی ئەم ڕۆژنامەیە(٩).

بە دەرچوونی دوا ژمارەی ڕۆژنامەی «ئومێدی ئیستیقلال»، ژمارە ٢٥، بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی شێخ مەحموود لە ڕاگەیاندنی خوێنراودا یەکی کەوت و تا ڕادەیێک مەیدان چۆڵ بوو. بەردەوامبوونی ڕۆژنامەگەریی کوردی لەو کاتەدا پێویست بوو. لەبەر ئەوە داگیرکەر ئەمجارەیان ڕۆژنامەی «**ژیانەوە**»ی دامەزراند و

روژکوردستانه — صحیفه ۱

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
م ۰ نوری

محرر
علی کمال

# روژکوردستان

اعلانات بدریك
۳ آنه ده سیترت

بدل آبونه
۳ مانك یك ٦ مانك دو
سالیکی چوار روپیه یه

بو همو شتیك مراجعت
به مدیر مسئول اکری

بوخارج اجرت پوسطه
علاوه دەکری

تاریخ انتشار
۱۵ تشرین ثانی ۱۹۲۲
سلیمانی
سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، فنن ەیکی رسمی یه

نسخهٔ به آنه یك — هفتهٔ جاریك دردچی — نسخهٔ به آنه یك

سال ۱ ژماره ۱ [ چوارشمه ] ۲۵ ربیع الاول ۱۳٤۱ ۱۵ تشرین ثانی ۱۹۲۲

ژمارەی (۱)ی لە (۱۸)ی ئابی ساڵی ۱۹۲٤، لە سەرەتا بە ٤ لاپەڕە و پاشان بە ٦ لاپەڕەی قەوارە (۳٤ بە ۲۱سم) دەرکرد. ئەم ڕۆژنامەیە ٥٦ ژمارەی لێ بڵاوبووەوە(۱۰).

وەک دەردەکەوێ نووسەران و خوێندەواران ئەوەندە کەیفیان بە ڕۆژنامەی **«ژیانەوە»** نەهاتووە لە ژێر سایەی داگیرکەر دەربچێ. لەبەر ئەوە لە سەرەتای ساڵی (۱۹۲٦)دا ڕۆژنامەی **«ژیان»**ی حکوومەت دامەزرا و ژمارە (۱)ی (۲٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۲٦ دەرچوو. لە ژمارە ٤۰٦ بەولاوە **پیرەمێرد** بووە بە سەرنووسەری تا ساڵی ۱۹۳۸ و ژمارە (٥٥۳)ی.

کە ڕۆژنامەی «ژیان» پەکی کەوت، پیرەمێرد ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی تازەی دەستکەوت بە ناوی «ژین». ژمارە (۱)ی ئەم ڕۆژنامەیە لە (۲٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی (۱۹۳۹)دا بە ٤ لاپەڕەی قەوارە گەورە دەرچوو. تا ساڵی ۱۹٥۰ پیرەمێرد خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەری بووە. کە ئەمری خوای بەجێیگەیاند «جەمیل سائیب و گۆران و نووری ئەمین بەگ و ئەحمەد زرنگ سەرنووسەریان کردووە. ڕۆژنامەی «ژین» تا (۸)ی شوباتی ڕەشی ساڵی ۱۹٦۳ بەردەوام بووە لە بڵاوبوونەوە.

هەروەها شارەوانی سلێمانی، ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی بە ناوی «ژیان»ەوە دەرکرد کە ژمارەی (۱)ی لە (۱۲)ی ئەیلوولی ساڵی (۱۹۳۷)دا بە (٤) لاپەڕە بڵاوبۆوە. ژمارەی (۷۰)ی لە نیسانی ساڵی (۱۹۳۹)دا دەرچوو.

لە شاری سلێمانی گۆڤارێک بە ناوی **«زانستی»** کە خاوەن و بەرپرسیاری **ساڵح قەفتان** بوو، ژمارە (۱)ی لە (۲٥)ی شوباتی ساڵی (۱۹۳۸)دا دەرچوو.

ئەو بزاڤە ڕۆژنامەگەرییە مەزنەی کە لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی شۆڕشی شێخ مەحموود، لە سەرەتای بیستەکانی ئەم سەدەیە لە ناوچەی سلێمانی دەستپێکرد، خۆی لە پایتەختی **میر مەحەمەدی ڕەواندوزی** «میری کۆرە» لەسەر دەستی یەکێک لە ڕۆژنامەوانە پێشەنگەکانی کوردستان **حوسێن حوزنی موکریانی** دۆزییەوە. موکریانی زۆر باش دەیزانی بەبێ چاپخانە و دەزگای چاپەمەنی زانست و زانیاری بڵاو ناکرێتەوە و تاریکیی ڕۆشن نابێتەوە. لەبەر ئەوە چاپخانەکەی حەڵەبی گواستەوە ڕەواندز و لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی (۱۹۲٦)دا گۆڤارێکی بە ناوی **«زاری کرمانجی»** بڵاوکردەوە. تا (۳۱)ی تەمووزی ساڵی ۱۹۳۲ بیست و چوار ژمارەی لێبڵاوکردەوە. کوردناسە ڕۆژئاواییەکان قەدر و قیمەتێکی زۆر گەورە لە موکریانی و چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی دەگرن. بۆ نموونە مینورسکی ڕووس بە موکریانی دەڵێ: ئێوە حەقیقەتەن گیانی میللەتی خۆتانن، ئەو ڕەنجانەی کە دەیکێشن هیچ وەختێک لە بیر ناچێتەوە، ئەسڵەن میللەت و وەتەنپەرستانی وەکو ئێوە مایەی تەرەقی میللەتن."(۱۱)

دیارە موکریانی بە خۆی و چاپخانە شڕەکەیەوە بۆی نەکراوە تا دوایی دژی هێزی تاریکی و کۆنەپەرستی ئەوکاتە بوەستێ، بۆیە ناچار بوو چاپخانە شڕەکەی بکاتە هەکبە و ئۆغر بکاتە شاری ئەفسانە و قەڵای دێرین "هەولێر". لە هەولێر گۆڤاری **«ڕووناکی»** دامەزراند و ژمارە (۱)ی ڕۆژی پێنجشەمەی (۲٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳٥ دەرکرد، ژمارە (۱۱)ی کە دوا ژمارە بوو، لە (۱٦)ی مایسی ساڵی (۱۹۳٦)دا دەرکرد. لە هەولێریش نەیتوانی کاربەدەستانی میری ڕازی بکا و ئەو شتانەی لەگەڵ بیر و بۆچوونی خۆی ناگونجێن بڵاویکاتەوە. ئەمجارەیان سەریهەڵگرت و بەرەو دەزگا ڕۆشنبیرییەکانی بەغداد تا خۆی لە گۆڤاری **«دەنگی گێتی تازە»** گرتەوە.

نووسەر و ڕۆشنبیرە کوردەکان لە پایتەختی عێراق ڕۆڵێکی ڕۆشنبیری گەورە دەگێڕن. **ساڵح زەکی ساحێبقران** گۆڤارێکی ڕێکوپێکی وێنەداری لە بەغداد دامەزراند. مانگانە بە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی «دیاری کوردستان»ی بڵاودەکردەوە. ژمارەی (۱)ی لە (۱۱)ی ئاداری ساڵی ۱۹۲٥ بە ۳۲ لاپەڕە دەرکرد. ژمارە (۱٦)ی لە ڕۆژی (۱۱)ی مایسی ساڵی (۱۹۲٦)دا دەرکرد و ئیتر ژمارەی دیکەی چاپ نەکرا.

لە ساڵی (۱۹۳۲)دا تاقە ژمارەیەک لە گۆڤاری **«دیاری لاوان»** و لە ساڵی (۱۹۳۳)دا تاقە ژمارەیەکیش لە گۆڤاری «یادگاری لاوان» لە لایەن دەستەیەک لە قوتابییە ڕووناکبیر و نووسەر و شاعیرە کوردەکانی بەغداد بڵاوبووەوە. ناوەڕۆکی ئەو دوو گۆڤارە، تازە بابەت بوون بەگوێرەی ڕۆژنامەگەریی پێش سییەکان و بۆنی ئەدەبی نوێخوازی ئەوروپاییان لێدەهات.

با ئەو تاقە **«پەیژە»** یە لە بیر نەکەین کە بە کۆششی تاقەکەسێک لە بەغداد بڵاو بۆوە. وا پێدەچێ سەرنووسەری "پەیژە" **مستەفا شەوقی**، بە قەڵەمە تیژ و بۆشتەکەی زۆربەی بابەتەکانی خۆی نووسیویەتەوە، ئەم تاقە گۆڤارە لە ساڵی (۱۹۲۷)دا بە ۳۲ لاپەڕە دەرچووە.

دوابەدوای ئەم دەستەگوڵە ڕەنگاوڕەنگ و بۆنخۆشانە ئۆرە

دێتە سەر گۆڤاری **«گەلاوێژ»**. بە گۆڤاری گەلاوێژ قۆناغێکی تازەی ڕۆژنامەگەریی کوردی دەستپێدەکا و دەرگایەکی تازە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا دەکرێتەوە. گەلاوێژ بە پێشکەوتووترین گۆڤاری ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردیی دەژمێررێ. سەرنووسەر و خاوەنی ئیمتیاز **ئیبراهیم ئەحمەد** و بەڕێوەبەری ئیداری **عەلائەدین سوجادی** بوو. ژمارە (١)ی لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩و دوا ژمارەی، کە ژمارەی ١١٦ بووە، لە ئابی ساڵی (١٩٤٩)دا دەرچووە. تێکڕای هەر ١١٦ ژمارەکەی ٧٢٧٩ لاپەڕەی قەوارە (١٤ بە ٢١سم)ە.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(١) د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاست و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨.

(٢) جەمال خەزنەدار، ڕۆژی کورد ١٩١٣، بەغدا، ١٩٨١.

(٣) تەواوی ژمارەکانی ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستی» هەر ٦٧ ژمارەکەی لە کتێبخانەی مۆزەخانەی بەغداد پارێزراوە. من فۆتۆکۆپی ژمارەکانم هەیە.

(٤) ڕۆژنامەی «پێشکەوتن» ١١٨ ژمارەی لێدەرچووە. بیستم کە ئەمساڵ لە هەولێر بە کتێبێک و بە پێشەکی د. مارف خەزنەدار بڵاوکراوەتەوە.

(٥) جەمال خەزنەدار، بانگی کوردستان (١٩٢٢-١٩٢٦)، بەغدا، ١٩٧٤.

(٦) جەمال خەزنەدار، ڕۆژی کوردستان (١٩٢٢-١٩٢٣)، بەغدا، ١٩٧٣.

(٧) C.J. EDMONDS: A Kurdish Newspaper, Rozh Kurdistan, Journal of The Central Asian Society, vol, xll, part 1, p.89-90, London, 1925.

(٨) د. کەمال فوئاد، «بانگی هەق» یەکەمین ڕۆژنامەی شۆڕشی کوردستان، گۆڤاری پرشنگ، ژمارەی (١) مارتی ساڵی ١٩٨٥.

(٩) جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، بە زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی، بەغدا، ١٩٧٣.

(١٠) ڕۆژنامەی ژیانەوە (٥٦) ژمارەی لێدەرچووە. هەموو ژمارەکانم لەگەڵ پێشەکییەک دەربارەی ڕۆژنامەگەری کوردی لە کوردستانی باکوور ئامادەکردووە بۆ چاپکردن.

(١١) جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، بە زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی، بەغدا، ١٩٧٣.

### جەمال خەزنەدار

* ساڵی ١٩٣٨ لە هەولێر لە دایک بووە.
* ١٩٥٨-١٩٦١ ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری "شەفەق" و پەیامنێری بووە لە بەغداد.
* ١٩٦١-١٩٦٣ ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری "یانەی سەرکەوتن" ی کوردان بووە لە بەغداد.
* ١٩٧. بووە بە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد و خاوەن و یەکێک لە دامەزرێنەرانی پرۆژەی گۆڤاری "دەفتەری کوردەواری" بووە.
* ١٩٧٢-١٩٧٩ سکرتێری نووسینی گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان" و سکرتێری دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کورد بووە.
* ١٩٧٣-١٩٧٤ سکرتێری نووسینی گۆڤاری "ئەستێرە" بووە لە بەغداد.
* ١٩٧٥-١٩٨٢ سکرتێری نووسینی گۆڤاری "شۆڕشی کشتوکاڵی" بووە.
* ١٩٨٢-١٩٨٥ خاوەنی پرۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی بووە.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

١- ڕابەری ڕۆشنبیریی جوتیاران، دوو بەش، بەغداد، ساڵی ١٩٧٢ و ساڵی ١٩٧٣.
٢- ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، بەغداد، ١٩٧٣.
٣- ڕۆژی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٣، بەغداد، ساڵی ١٩٧٣.
٤- بانگی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٦، بەغداد، ساڵی ١٩٧٤.
٥- ڕۆژی کورد ١٩١٣. بەغداد، ١٩٨١.

ژمارەیەک بەرهەمی تری هەیە کە تا ئێستا بە چاپی نەگەیاندووە.

# سەر قۆزی بن ئالۆز*

"ئەم نووسینە سەرەنجامی گەشتێکی ٢٥ ڕۆژییە بۆ خوارووی کوردستان"

له هەولێر:

**- نزیکەی ٤٥ ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردیی، بە قسەی سەرۆ قادر، دەردەچێت**

**- جاری وا هەیە بە سێ منداڵ کتێبێکیان هەیە بە نۆرە دەیخوێننەوە**

**- وێنەگرتن قەدەغەیە، دەبێت لە ئاسایش مۆڵەت وەربگریت**

**- موختار دەزانێت کامە کەس سەر بە چ ڕێکخراوێکە و چۆن بیر دەکاتەوە**

**- بەخشیشی پارەوپووڵ و برنجی چاک و ڕۆن و دەرمان..**

**- پەیوەندی پارتی و ڕژێمی عێراق شتێک نییە بشاردرێتەوە**

**- تورکمانەکان ژمارەی بارەگاکانیان گەیشتبووە ٧٧**

**- بزمارێکی درێژیان لەبن پێی کابرایەکی سەر بە یەکێتی کوتا**

**مەهاباد کوردی / سوید - دیسێمبەری ١٩٩٨**

---

بەر لە هەر شتێک دەمەوێ ئەوە بڵێم کە باس و ڕووداوەکانی ئەم نووسینە زیاتر پەیوەندییان بە ماوەی نێوان کۆتایی مانگی ئۆکتۆبەر تا کۆتایی مانگی نۆڤێمبەری (١٩٩٨)ەوە هەیە. من کە بۆ ماوەی ٢٥ ڕۆژ لە باشووری کوردستان مامەوە، ئەوەی بەرچاوم کەوت و بیستم یان بۆیان باس کردم، وا لێرەدا بێ پێچ و پەنا دەیانخەمە بەر دیدەی خوێنەران. دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوەش بکەم، من لە هەر گەشتێکمدا بۆ کوردستان، بیر لە نووسین و ئامادەکردنی بابەتێک دەکەمەوە کە لە ئەنجامی گەشتەکە خۆیدا دروست دەبێت. جا لێرەدا نامەوێ زیاتر سەرتان بیەشێنم و وای بە باش دەزانم یەکسەر بچمە سەر کرۆکی ئەو باس و خواسانەی کە تایبەتن بە گەشتەکەم.

## له برایم خەلیلەوە تا هەولێر

دوای سێ سەعات چاوەڕوانیی پەڕینەوە بۆ ئەودیوی پردەکە. چەکدارێکی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان پەساپۆرتەکانی لێ وەرگرتین. لە دەفتەرێکی زلدا یەکە بە یەکە ناوەکانمانی نووسی. لە دواییدا لێمانی پرسی: زێڕی زیادەتان پێیە؟ ئافرەتەکانیش دەست و پەنجەی خۆیان نیشان دا. لەسەر دیوار شتێ نووسرا بوو کە تیایدا ڕێگە بە گەشتکەران دەدرێت تەنیا ٢٠٠٠ دۆلار زیاتریان لە گیرفاندا نەبێت. هەر لە هەمان کاتدا جەخت لەسەر کامێرای ڤیدیۆ و کەرەسەی کارەباییش دەکرا.

لە دواییدا هەمووومان بە یەکەوە چووینە ئەو شوێنەی کە پەساپۆرتەکانمانی لێ تۆمار دەکرا. کچێکی ڕووخۆشی خەڵکی سلێمانی بەخێرهاتنەوەمانی کرد. پەساپۆرتەکانمانی لێ وەرگرتین. کوڕێک، کە ئەویش خەڵکی سلێمانی بوو و لەگەڵمان بوو، دیار بوو زۆر حەزی لە قسەکردن بوو و زۆریش لە کچەکە ڕادەما. هەر لەبەر هەندێ کچەکە پێی گوت: تۆ زۆر قسە دەکەی!

پارەی فۆتۆکۆپی پەساپۆرتەکان و هەر نەفەری ٥٠ دۆلاری گومرگیشیان لێ وەرگرتین و یەک دوو کاخەزی زەرد و سپییان پێ داین کە بە کوردی و عارەبی نووسرابوون. هەردوو براکوردی خەڵکی سلێمانی هەر لەوێ خواحافیزییان لێمان کرد و بەرەو سلێمانی کەوتنە ڕێ. ئێمەش بەرەو هەولێر سواری تەکسی بووین. کابرای شوفێر خەڵکی زاخۆ و قسەخۆش بوو، بەڵام نەیدەویست زێدە خۆی لە قەرەی باسەکان بدات.

لە ڕێگا سەیتەرەکانی پارتی تەنیا یەک جار سندووقی ئۆتۆمۆبیلەکەیان پێ کردینەوە. لام وابێ هەر یەک جاریش تەماشای پەساپۆرتەکانیان کردین. جادده و ڕێگاوبانەکان، لە چاو ساڵانی ٩٢ و ٩٥ و ٩٧، تا بڵێی جیاوازییان هەبوو و خۆش و قیرتاو

لە کتێبەکانی قۆناغی خوێندنی سەرەتاییدا نووسراوە:

**- زاخۆ یەک لە شارە جوانەکانی عێراقی خۆشەویستمانە**

**- ئێمە خەڵکی یەک نیشتیمانین کە عێراقی خۆشەویستە، تۆ لە باکووری و منیش لە باشووری**

**-فایەق بێکەس عێراقی نیشتیمانی خۆی و گەلی عێراقی خۆش دەویست**

کرابوون. زۆر ڕێکخراوی خێرخوازیی بێگانەش، بۆ نموونە ڕێکخراوی قەندیل(Qandil)ی سویدیی، لەم بوارەدا جێ دەستیان دیارە.

دوای ساڵێک و حەفت مانگی تەواو بە زێد و نیشتمان و خزم و کەس و کار و گوند و هاوڕێ و ئازیزانمان شاد بووینەوە.

## بار و دۆخی ناو شاری هەولێر لە چەند ڕوویکەوە

ئاسان نییە پاش ئەوەندە ساڵ خەبات و خوێن و قوربانیدان هەر دڵمان بەوە خۆش کەین لە فلانە شار هەرزانییە، ئاو و کارەبا هەن، ئاساییش هەیە،...هتد. ئەمەک و ڕەنج و خۆ فیداکردنی ئەو میللەتە هیچ ڕۆژێک لە پێناوی ئەو شتانەدا نەبوون و نابن کە لەم چەند دێڕانەدا باسیان لێوە دەکرێت. ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە لە پێناوی نرخ و بەها هەرە پیرۆزەکانی مرۆڤدا گیانی خۆیان بەخت کرد و بە تەمای ڕۆژێک بوون کە هەر نا، وەک مرۆڤ، ڕێزیان لێ بگیرێت. گەلۆ لە باشووری ئەمڕۆدا تا چ ڕاددەیەک خەون و هیوا و ئاواتەکانی لەمێژینەی کورد بەدی هاتوون؟

ئێستا با پێکەوە سەرنجێک لە ڕەوش و گوزەرانی خەڵک و چۆنیەتی ژیان لە هەولێری پایتەخت و ئەو شارە دێرینەی کوردستان بدەین.

هەولێر شارێکی بە جمۆجۆڵی زیندووە. دانیشتوانەکەی تا شەو درەنگانێکیش هەر خەریکی کار و کاسبیی خۆیانن. دزی و ڕێگری و ڕووتکردنەوە لەم شارەدا تا ڕاددەیەکی باش کەم بوونەتەوە. هێمنی و ئاسایش بەدی دەکرێن. خەڵکی کاسبکار و بێلایەن لە جاران زیاتر دڵیان خۆشە و هەر خوا خوایانە هەردوو لا( یەکێتی و پارتی) پێک بێن و ئاشتی و ئاسایش کوردستان بگرنەوە. دیاردەی چەکداریی بە شێوەیەکی کەم لەنێو شەقام و کۆڵانەکانی شاردا دەبینرێت. دانیشتوانی شاری گەورەی هەولێر دڵخۆشی خۆیان دەردەبڕن بەرامبەر بە هەبوونی ئاو و کارەبا و هەرزانیی و بە پلەی یەکەمیش دابەشکردنی خواردەمەنی بەپێی بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان (نەوت بەرامبەر بە خۆراک)، کە کوردستان بەشێکی داهاتی نەوتەکەی لە شێوەی کەرەسەی خواردەمەنی و پێداویستییەکانی تری ژیان بەبەر دەکەوێت. ئەوی ڕاستی بێ خەڵکی هەژار و داماوی کوردستان لە ئەنجامی ئەو بڕیارەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا گیانێکی بەبەردا هاتەوە و هەناسەیەکی شادی هەڵکێشا. بە قسەی خەڵک خۆیان خێزانی وا هەن کە لە مانگێکدا بۆ ماوەی ٢٠ ڕۆژ پشت بە یارمەتییەکانی (U.N) دەبەستن. ئەم جۆرە یارمەتییانە لە هەولێر بە (بایەع) ناو دەبرێن. ڕاستە جۆری خواردەمەنییەکان ئەوەندە باش نین، بەڵام کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر گوزەرانی خەڵکەکە هەیە. هەندێ لەو شتانەی کە دەدرێن ئەمانەن: ئارد، ڕۆن، برنج، فاسۆلیا، قوتووەشیری منداڵان و گەلێ کەرەسەی دیکەش. برنجەکە کەرت کەرتە. هەرچی ڕۆنەکەیە بە قسەی دکتۆرێک ئەگەر بقرچێنرێتەوە و لە پاشاندا بەهێنرێت، بەکارهێنانی بۆ مرۆڤ باشتر دەبێت. جێگای داخە هەندێ جار خواردەمەنی و شتی تری وا بەسەر خەڵکدا دابەشکراون کە ماوەی بەکارهێنانیان بەسەر چووە (ئێکسپایەریان کردووە). نازانم ئەم کارە بە ئەنقەست ئەنجام دراوە یان نا؟!

لە هەولێر کاری بیناکردنەوە و ئاوەدانکردنەوە دیاردەیەکی بەرچاوە. بەشێکی ئەم کارە لە ئەستۆی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە خێرخوازە بێگانەکان و کەسانی سەربەخۆ و خەمخۆر دایە، بەشەکەی دیکەش حیزبی حوکمڕان و حکومەتی هەرێمی کوردستان لە هەولێر پێی ڕادەبێت. کاری ئاوەدانکردنەوە ئەم بوارانە دەگرێتەوە: خانوو دروستکردن لە لایەن هاووڵاتیان خۆیانەوە، شەقام قیرتاوکردن، بنیاتنانی باڵەخانەی نوێ، مزگەوت دروستکردن، بارەگا و بنکە چەکدارییەکان، دروستکردنی نەخۆشخانە لە لایەن ڕێکخراوی جۆراوجۆر و حکومەتیشەوە، جگە لە هەندێ قوتابخانە و دام و دەزگای تریش.

لە هەندێ شوێنی هەولێردا پەیکەر و گۆڕەپان و ئافوورەی ئاو و باخچەی ساوایان و باخ و جێگای حەسانەوە بەر چاو دەکەون. هەندێک لەمانە لە کاتی خۆیدا دروست کراون، هەندێکیشیان بێگومان تازەن. باخچەی خانزاد و گڵکەند دوو نموونەن. گڵکەند کە لە سەردەمی بەعسیشدا هەر هەبوو، بە هەندێ گۆڕانکاری تازەوە سەرلەنوێ لە لایەن وەزیری شارەوانی و گەشت و گوزاری حکومەتی هەرێم لە هەولێر، حوسێن سنجاری، لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٧)دا کراوەتەوە. باخچەی گڵکەند چەرخ و فەلەکی منداڵان و شوێنی یاریکردن و ئافوورە و جێگای دانیشتن و باخچەیەکی ئاژەڵانیشی تێدایە. لە باخچەی ئاژەڵاندا ئەم ئاژەڵانە دەبینرێن: بزن، پشیلە، گورگ، سیسارکە کەچەڵ، مەیموون، وشتر، بەراز، کەناری، کەروێشک، ڕێوی، کۆتر و هی تریش. ئەمانە بە جیا جیا لە شوێنی خۆیان دان کە هەندێکیان شێوەی قەفەسیان وەرگرتووە. ژمارەی زۆربەی ئەم ئاژەڵانەش لە یەک دووانێک تێپەڕ ناکات. مەیموونە بەستەزمانەکە کە بۆتە مایەی گەشمەری پێکردنی خەڵک، کاتی خۆی لەگەڵ مەیموونێکی دیکەدا لە ئێران هەریەکە و بە ٧٠٠٠ دیناری ئەسڵیی عێراقی کڕاون. بە قسەی یەکێ لە کرێکارەکانی باخچەی ئاژەڵان مەیموونێکیان بە ٣٠٠٠ دینار قازانج (بە ١٠٠٠٠ دینار) فرۆشتۆتەوە. لەبەر چاوی خۆم چەرخێکی دەستییان (چەکماغ) بە مەیموونەکە شکاند. هەر کەسێک ڕوو بکاتە باخچەی گڵکەند لەبەر دەرگا دەپشکێنرێ و کە



**وێنەی شاری هەولێر**

بیەوێ سەیری ئاژەڵەکانیش بکات، دەبێ پارەیەکی کەم (یەک دوو دینارێک) بە کرێکارەکان بدات. ڕەنگە ئەو شتەی کە دیمەنی باخچەی گڵکەندی ناشیرین کردبێ، میوانخانەی شیراتۆنی کون کونکراو بێت کە ئەویش خۆی لە خۆیدا ڕووێکی دزێوی هەردوو حیزبە شەڕخوازەکەی باشوورمان پیشان دەدات.

لە پایتەختی کوردستاندا، چالاکییەکی بازرگانیی گەرموگوڕ و تێکەولێکە و ئاڵوگۆڕێکی دیارمان وەبەر چاو دەکەوێت. هەر کەسە و خەریکی پەیداکردنی نانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیەتی. مامۆستا کە مووچەکەی بەشی ناکات، دەچێ لادایەک دەکرێ و وەک تەکسی کاری پێ دەکات. پزیشک لە پەنای کاری خەستەخانە و دەرمان گلدانەوەش، عیادەیەک بۆ خۆی دەکاتەوە و چەند قاتی مووچە ئەسڵییەکەی دەست دەکەوێت. مووچەخۆری حکومەت و ئەندازیار و تەنانەت ڕۆشنبیر و هونەرمەندانیش ڕێگەی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ ئەوەی کەمێک بە تێروتەسەلی بژین. لە کوردستانی ئەمڕۆدا هەر کەسە و چەند ئیشێک دەکات. ئەگەر هەر کەسێکیش وا نەکات، دیارە پشتی بەم و بەو و بە حیزب و لایەنێک قایمە، دەنا خوا بە خۆی دەزانێ چی بەسەر دێت. بە قسەی کابرایەکی دەوڵەمەند ئەمڕۆ لە کوردستاندا چینی مام ناوەنجی نەماوە. ئەوانەی هەژار بوون یان ئێستا دەوڵەمەندن یانیش لە جاران هەژارترن. زۆر خواپێداو و دەوڵەمەندیش هەبوون، ئێستا کافر زگی پێیان دەسووتێت.

نرخی شتومەک و خواردەمەنی و کەرەسەی ناوماڵ بە پلەی یەکەم پشت بە بەرزبوونەوە یا دابەزینی دۆلار دەبەستێت. هەر کاتێک نێوان ڕژێمی عێراق و نەتەوە یەککگرتووەکان (لیژنەی چەک داماڵین/ئۆنسکۆم) تێک بچێت، نرخی دۆلار بەرز دەبێتەوە، وە بە پێچەوانەوە. ئەو کاتەی من لە کوردستان بووم دۆلارێکی ئەمریکی دەیکردە ١٧ دیناری عێراقی. نرخی هەندێ کەلوپەل و کەرەسەی خواردەمەنیش بەم جۆرە بوو:

کیلۆی پەتاتە بە ٢-٣ دینار، کیلۆی تەماتە بە ٣-٤ دینار، کیلۆی مریشک(زیندوو) بە ١٨-٢٠ دینار، کیلۆی هەنار بە ١-٢ دینار، سەموون (درێژکۆلە) دانەی بە دینارێک، سەموون (خڕ) دانەی بە ٢ دینار، قوتووەشیرێکی منداڵان (هۆڵەندیی) بە ٤٠ دینار،...هتد. شایانی باسیشە مووچەی مانگانەی کرێکارێک، بۆ نموونە لە کارگەی ڕستن و چنین لە هەولێر، ٣٠٠-٤٠٠ دینار دەبێت. دەبێ ئەوەش بڵێین سەرەڕای هەموو زەحمەتییەکیش ڕەوشی ژیان لە کوردستاندا لە زۆر لایەنەوە لە ڕەوشی ژیان لە ناوەڕاست و باشووری عێراق چاکترە. ئەمە قسەی من نییە، بەڵکو خەڵکانێک خۆیان چوونەتە بەغدا و هەندێ لە شارەکانی دیکەی عێراق و ئەوەی بە چاوی خۆیان بینیویانە بۆ منیان گێڕاوەتەوە. هەڵبەت بە خۆشمان زۆر جار ڕاپۆرت و ڕێپۆرتاژمان لەسەر باری ناڵەباری ناوخۆی عێراق لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی جیهان چاو پێ کەوتووە. من لە هەولێر کەسانێکی عارەبم بینیوە کە بۆ مەبەستی کڕین و فرۆشتن و بازرگانیکردن ڕوویان کردۆتە ئەم شارە و لەگەڵ خۆشیاندا زۆر شتومەک دەبەن بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بیفرۆشنەوە و قازانجێکیان پێ ببڕێت.

بە گوێرەی بەرنامەی (نەوت بەرامبەر بە خۆراک) وەزارەتی تەندروستی لە حکومەتی هەولێر ٤ ئۆتۆمۆبیلی ئەمبولانس (فریاگوزاریی) و هەروەها بڕێکی دیارکراوی لە داوودەرمان و کەرەسەی پزیشکی بەر دەکەوێت. چوار ئەمبولانسەکە ئێستا لەسەر شەقامەکانی هەولێر دەسووڕێنەوە و لە کار دان. هەر بە هەمان شێوە دەرمان و کەلوپەلی ناو نەخۆشخانان دابەش کراون و هەندێ بنکەی تەندروستی و خەستەخانەش بنیات نراون. ڕێکخراوە خێرخوازی و بیانی و هەندێ لە دامودەزگا و هێزە سیاسییە کوردییە ئایینییەکانیش (یەککگرتووی ئیسلامیی کوردستان) بەم کارانە ڕادەبن. هەر لەم بوارەدا دەکرێ ناوی (هیئە الاغاثە الاسلامیە العالمیە) بەرین. بڕێ لە گوندەکانیش نەخۆشخانەیان لێ کراوەتەوە. لە کوردستان هەندێ جۆر نەخۆشی بڵاو بوونەتەوە کە پێشتر زۆر کەم بوون. بە قسەی خەڵک ئێستا گەلێ کەس بە (زەخت) دەمرن. هەروەها کە خۆم لە هەولێر بووم زۆر جار باسی نەخۆشی کۆلێرا دەکراو، تەنانەت باسی ئەوەش دەکرا کە ٧٠ کەس لە ئەنجامی تووشبوون بەم نەخۆشییە گیانیان لە دەست داوە. خەڵک لە جاران کەمتر کەرەوز و کەوەر و تەماتە و تووریان دەخوارد. بە بڕیاری وەزارەتی تەندروستی لە هەولێر دووکانی هەموو شەربەتفرۆشەکان داخرابوون. ئەوان بۆیان هەبوو بە تەنیا کاستەر و باقلاوە و شتی لەو بابەتانە بفرۆشن. هەروەها سەریەشە و زگچوونی منداڵانیش هەبوو. بۆ مەسەلەی کڕینی داوودەرمانیش، هەر لەسەر جاددەی (شێخەڵلا)وەڕا بیگرە تا خەستەخانە و دەرمانخانەکان، دەرمان و کەرەسەی پزیشکی دەبینرێن. زۆربەی دەرمانەکان ئێرانی و تورکی و هی وڵاتانی بێگانەن. بە پارەی زیاتر دەرمانی چاکیش (سویسری و فەڕەنسی و بەریتانی و هی تریش) چنگ دەکەون.

بە مەبەستی پاکڕاگرتنی شاری هەولێر، دایەرەی



کاتی گرتنەوەی شاری هەولێر،31-8-96



فۆتۆ: فەواز نورەدین. DN. فەلەستینیی، ئالای ئیسرائیل و بوکەشوشەی سەروک وەزیرانەکەی لە گەزە دەسوتێنن. ئەمە لە کاتێکدا کە لە گفتوگۆشدان.

شارەوانیی هەولێر، لەسەر شەقامە سەرەکییەکان بەرمیلی داناوە تا زبڵ و پیسیی تێ بکرێ. لە هەمان کاتدا دووکاندارەکان ئاگادار کراون کە دەبێ لەبەردەمی دووکانەکانیان دار و نەمام بروێنن. برێ لە دووکانداران ئەم کارەیان کردووە. عەرەبانچییەکانی شێخەڵلا لە شوێنی خۆیان دەرکراون، بگرە لە هەندێ باردا زیندانیش کراون. برادەرێکی خۆم کە تەکسی هەیە بۆمی گێڕاوە کەوا چۆن دوو کەس لەو قوربەسەرانەی، وێڕای دوو پۆلیس، لە بنکەی پۆلیسی خانەقاوە بۆ زیندانی ئاسایش (سجنی محەتتە) گواستۆتەوە. هەڵبەت دوای دەرکردنی عەرەبانچییە کاسبکارەکانی شێخەڵلا چ شوێنێکی تریان دەقەبەڵ نەکراوە تا کاری خۆیانی تێدا بکەن. گومانیش لەوەدا نییە کە ئێستا دیمەنی شێخەڵلا لە جاران ڕێکوپێکتر بووە.

## پارتی و هەولێر و چەند شتێک

هەولێر کە بووەتە گرێکوێرەی نێوان پارتی و یەکێتی تا ئێستا زۆر کارەسات و کۆمەڵکوژی و دەردەسەری بە خۆیەوە بینیوە. سەبەبکاری ئەمانە هەمووشیان بە پلەی یەکەم هەردوو هێزە سەرەکی و دەسەڵاتخوازەکەی باشووری کوردستانن. سەرانی یەکێتی و پارتی کە گوێیان لە کەس نەگرتووە، تازە بە تازە شانەکە لە سەری کورددا دەشکێنن، تاڵەبانی دەڵێت: "ئەو شەڕەی کە کراوە نە لە دەسەڵاتی مندا بوو نە لە هی (الاخ مسعود البارزانی)"(١). ئەمە ڕێی تێدەچێت، بە گوێرەی ئەم قسەیە ئەوان تەنیا فەرمانی داگیرکەرانی کوردستانیان جێبەجێ کردووە.

دانیشتوانی هەولێر هەتا ئەمڕۆش باسی گرتنەوەکەی هەولێر دەکەن کە بەعس و پارتی لە (٣١)ی ئابی ١٩٩٦ پێی ڕابوون. هەروەها باسی هێرشکردنە سەر بنکەی ڕۆشنبیریی میزۆپۆتامیا و نەخۆشخانەی مانگی سووری کوردستان و بارەگا و بنکەکانی پ.ک.ک دەکەن کەوا چەند دڕندانە، بە هاوکاریی تورک و تورکمان، ئەنجامیان دان. خەڵک باسی ڕاوەدوونان و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ دەکەن، بە تایبەتیش باسی سەرەتای گرتنەوەکە و ئان و ساتی هێرشە بەربڵاوەکەی تورکیا بۆ سەر خوارووی کوردستان دەکەن. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت ئێمەی کورد بە دەردی ئیسماعیل بێشکچی گۆتەنی زوو قەسابخانە و کارەساتەکانمان لەبیر دەچێتەوە. تا ئێستا چەندمان بۆ هەڵەبجە و ئەنفال و بادینان و بارزانییان و ئێرە و ئەوێ کردووە، هەر ئەوەندەش بۆ قەسابخانەکەی هەولێر و هێنانی عێراق و ئێران و تورکیا دەکەین. ئێمە کە میللەتێکی خۆخۆرین بە ئاسانی و زۆر زوو شتان لەبیر دەکەین.

ڕاستە لە هەولێر جموجۆڵێکی ڕۆشنبیری و کاری چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێبان لە ئارادایە. دەوروبەری (٤٥ ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەی کوردی بەتەنێ لە هەولێر دەردەچن)(٢). چاپکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە حکومەتی هەرێمی کوردستان/هەولێر لە ساڵی ١٩٩٨دا لە ٥٦ کتێب زیاتر بووە(٣). هەر لە هەولێر کۆڕی زانیاریی کوردستان بە سەرۆکایەتی شوکر مستەفا دامەزراوە. پەخشی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنیی جۆربەجۆر بەدی دەکرێ. ئەمانە هەموویان ڕاستین و ناشاردرێنەوە. ئەوەی لێرەدا دەمەوێ باسی بکەم تاکە یەک خاڵە: هیچ کام لەو گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوە و دام و دەزگایانە ببڕای ناتوانن بە ئازادییەکی تەواوەوە بیروڕای خۆیان سەبارەت بە مەسەلە جوداکان دەرببڕن. پارتی دەسەڵاتدار لە هەولێر، پارتی دیموکراتی کوردستان، ڕێگە بە هیچ لایەنێک نادات بە ئارەزووی خۆی شتەکان باس بکات. لە لایەکی ترەوە تا ئێستا حیزبە کوردییەکانی هەولێر و ناکوردییەکانیش نەیانوێراوە بە ئاشکرا و ڕاستەوخۆ هەڵوێستی خیانەتکارانە و دەستتێکەڵاوکردنی پارتی لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان ڕیسوا بکەن. بەر لە چوونەوەم بۆ کوردستان بە یەک هەفتە برایەکی سەر بە لایەنێکی کوردیی ئیسلامی تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی: "پارتی دەستی کردووە بە هێنانەخوارەوەی ناوی ڕێکخراوەکەمان لەسەر بارەگاکان لە ناوچەکانی دهۆک و بادینان. ئێمە خەریکی کاری خێرخوازین و ئەمەش وا لە پارتی دەکات کە لێمان قیت بێتەوە و لە کەمبوونەوەی دەسەڵاتی خۆیشی لە ناوچەکە بترسێت. ڕاستە هەردوو حیزبە دەسەڵاتخوازەکەی باشوور هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان چ حیسابێکی ورد و درشتیان بۆ ڕێکخراو و لایەنەکانی دیکە نەکردووە و ناکەن".

هاوڕێیەکی خۆشەویستی سەردەمی خوێندنم، کە ئێستا لە گوندێکی دەوروبەری شاری هەولێر مامۆستایە، پێی گوتم: "هەر

کەسێک ڕەخنە لە پارتی بگرێت بۆ سبەینێ تەرمی خۆی لە بەستی قەتەوی(٤) دەبینێتەوە". شتێکی ڕوون و ئاشکرایە لەوەتی پارتی و بەعس هەولێریان گرتۆتەوە زۆر ڕووداوی وا قەوماون. مامۆستای زانکۆ و مەلای مزگەفت و خەڵکی ڕەشۆکیش بەر ئەم ڕەشەکوژییە کەوتوون. دانیشتوانی هەولێر دەگێڕنەوە، کە پارتی و حکومەت هاتنەوە گەڕەک بە گەڕەک خەڵک تەمێ و دارکاری دەکران. هەر شەوەی بەسەر گەڕەکێک دا دەدرا. پێشومخت ئەندامان و لایەنگران و دۆستانی یەکێتی دیاری دەکران. لە گەڕەکی (٩٩)ی هەولێر بزمارێکی ئەستوور و ژەنگاویی درێژیان لەبن پێی کابرایەکی سەر بە یەکێتی کوتا. هەر بە دەسیسە و چاوساغیی پارتی ڕژێمی بەعس لە کەرکوک پیاوێکی٦٠ ساڵەی سەر بە یەکێتییان گرت و چاوەکانیشیان هەڵکۆڵی. ئێستا کچە عازەبەکانی ئەو بە ڕەشپۆشی لە هەولێر دانیشتوون و ئەوەی هەیانبێ و نەیانبێ تاقە برایەکە کە بەدەم خوێندنەوە کاری تەکسی دەکات. ئەمانە مشتێک لە خەرواری کارەسات و بەسەرهاتە دڵتەزێنەکانی شەڕی خۆکوژی و کوردکوژیی سەرانی کوردن لە خوارووی وڵات.

لە هەولێر وێنەگرتن قەدەغەیە. دەبێ لە ئاسایش مۆڵەت وەربگریت تا بە کامێرای خۆت وێنە لەنێو شاردا بگریت. ئەگەر نا تووشی لێپرسینەوە و کێشمەکێش دێیت. هەندێ لە وێنەگران، گەر بە هەڵەدا نەچوویم، لە سەندیکای هونەرمەندان مۆڵەتیان دراوەتێ تا بە پارە کاری وێنەگری بکەن. هەر بۆ نموونە لە باخی گڵکەند و دەورپشتی قەڵا ئەو جۆرە وێنەگرانە دەبینرێن.

بەبیرم دێ لە سەردەمی بەعسدا موختاری گوند یا گەڕەک هەندێ کاروباری جیا جیایان ڕادەبەڕاند، بۆ نموونە: ئاگادارکردنەوەی ئەو کەسانەی کە ناوی سەربازییان هاتووە، ئاگادارکردنەوەی ئەو کەسانەی کە داوایان لە دادگا لە هەمبەر کراوەتەوە و شکایەتیان لێ کراوە، یان هەندێ کاروباری تری لەم جۆرە. هەرچی موختاری گەڕەکە لە هەولێری ئەمڕۆدا کارێکی شێوە موخابەراتی پێ سپێردراوە. موختار دەزانێت چ خێزانێک منداڵیان بووە. موختار دەزانێت لە گەڕەکی سەر بە خۆیدا کێ دیارە و کێ دیار نییە. موختار دەزانێت لە فلانە خێزان کامە کەس سەر بە چ ڕێکخراوێکە و چۆن بیر دەکاتەوە. ئەگەر کەسێک بۆ ماوەیەک دیار نەبێت، موختاری گەڕەک دەست دەکات بە لێپرسینەوە و پرسیارکردن لە کەسوکاری دیارنەبووەکە. هەموو کەسێکیش بۆی نییە ببێت بە موختاری گەڕەک. تەنیا ئەو کەسانە دەکرێن بە موختار کە کەم تا زۆر لایەنگر و دۆستی پارتین.

دەکرێ بپرسین دوای ئەم هەموو ماڵوێرانی و کوردستانفرۆشتنە، دەبێ چ هێزێک هەبێ لە پشت پەردەوە یا بە ئاشکرا هێزی پارتی ڕاگرتبێ؟! گومانم لەوەدا نییە زۆربەمان چەند لایەنێکی وەرامی ئەم پرسیارەمان لا ڕوون و ئاشکرایە. هەڵبەت ئەو خەڵکانەی کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتیدا ژیان بەسەر دەبەن، لە زۆر ڕووەوە لە من و تۆ باشتر لەم مەسەلەیە دەگەن و زیاتر شارەزای شێواز و میتۆدەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانن. پارتی هەموو کەرەسە و ئامرازێکی بەکارهێناوە و دەهێنێ تاکو بە هەر شێوەیەک بێ لە گۆڕەپانەکەدا بمێنێتەوە. دەکرێ هەندێ شت بە نموونەوە بهێنینەوە: خەڵک کڕین بە پارە، دەم چەورکردنی کەسانێک کە بە داخەوە برێ لە ڕۆشنبیرانیش لەنێو ئەم زەڵکاوەدا چەقیون، بەخشینی پارە و پوول و برنجی چاک و ڕۆن و دەرمان چا و کەلوپەلی هەمەجۆر بە چەکدارەکانی خۆی، لەخۆکۆکردنەوەی کەسانێک لە میانەی دامەزراندن و کار پێدانیان لە دام و دەزگا و دایەرەکاندا، دروستکردنی میلیشیا و دەسەڵات پێدانیان (چەکدارەکانی ماڵی عەلی قەلاب لە هەولێر/لای باداوە بۆیان هەیە زەوی و زاری خەڵکیش گر بدەن و پاشان بیفرۆشنەوە، لێپرسراوی سەربازیی پارتی وا هەن کە لە ڕادەبەدەر دەسەڵاتیان هەیە و مامەڵە بە ماڵ و موڵکی خەڵک دەکەن، دروستکردنی خانووبەرە - لە نزیک ڕێگای نێوان کەسنەزان و هەولێر - بۆ کەسانێک کە پێشتر هەر هەموویان سەرۆک جاش و - جحافل خفیفە - ی سەددام بوون)، بڕینەوەی مووچەی مانگانە بۆ هەندێ لە نووسەران و ڕۆشنبیران هەر بۆ ئەوەی شتێکیان لێ هەڵبکڕێن و لە کاتی پێویستدا سوودیان لێ ببینن (جێگای داخە لە ئەورووپاش کەسانێک هەن کە ئەم ڕێگەیەیان گرتۆتە بەر و هەندێکیشیان ئێستا وا لە کوردستانن/گۆرانیبێژێک کە کاسێتی خۆی پێشکێش بە من دەکرد و لەسەریشی دەنووسی: بە نووسەری خاوەن هەڵوێست مەهاباد کوردی پێشکەشە. ئێستا ئەو گۆرانیبێژە، لەبەر خاتری چەند هەزار دۆلار، ئەوەی کە بیری لێ نەکاتەوە هەڵوێست و هەڵوێست نواندنە)(٥). ئەمانە و با دەستتێکەڵاوکردن لەگەڵ دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانیش لە شوێن خۆی بوەستێت، کە بێگومان هۆکارێکی گەلێ گرنگە بۆ مانەوەی پارتی و ڕابوون بە ڕۆڵی خۆی (جا هەر ڕۆڵێک بێ) لە کوردستان و ناوچەکەدا.

هەر لەم بوارەدا دەکرێ باسی چەند مەسەلەیەکی دیکەش بکەین کە گرێدراون بە هەمان بابەتەوە. دوای هاتنەوەی پارتی بۆ هەولێر، بە زەبری دەبابەی بەعس، چەند گۆڕانکارییەک لە کوردستان و هەرێمەکەدا ڕوویان دا کە برێکیان زۆر بە چاکی بە بەرژەوەندی پارتی شکانەوە. بۆ نموونە: دابەشکردنی خۆراک بەسەر خەڵک بەپێی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر شێوەی بیرکردنەوەی خەڵکی ڕەشۆکی و بێناگای کوردستان. من ناڵێم جەماوەری کوردستان ئاگایان لە هیچ نییە و شتە ڕەش و سپییەکان لە یەکتر جیا ناکەنەوە، لێ بەڵێ ئەوەی کە لێی دڵنیام خەڵکێکی زۆر هەن ئەم کارە بە چاکەیەکی پارتی دەزانن و بگرە ئامادەیی ئەوەشیان تێدایە لە سبەینێوە تا ئێوارێ داکۆکی لە بیروڕای خۆیان بکەین. ئەوان تا چ ڕادەیەک لەسەر ڕاستین یان نا، ئەمە چ شتێک لە مەسەلەکە ناگۆڕێت.

## پەیوەندی پارتی و ڕژێمی عێراق

هەبوونی پەیوەندی لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕژێمی عێراقدا شتێک نییە کە بشاردرێتەوە. پەیوەندییەکە گەیشتۆتە ئەم قوناغە: کاتێ لە هەولێر بووم لێپرسراوێکی بەرزی سەربازیی پارتی/سوپای دووی دەشتی هەولێر بریندار بوو(٦). هەر یەکسەر بردیانە مووسڵ. خەڵکێکی زۆر کە دەیانناسم بۆ دیدەنی کابرای بەرپرسیار بەرەو مووسڵ چوون. دکتۆری تایبەتیی عودەی کوڕی سەددام حوسێن سەرپەرشتی کاری نەشتەرگەریی کاکی لێپرسراوی دەکرد. لە ماڵی کابرایەکی ناسیاو و ناسراوی



وێنەی سەددام حوسەین و مەسعود بارزانی

هەولێر دانیشتبووم کە بە تەلەفۆن لەگەڵ باوکی لێپرسراوە بەرزەکەی پارتی قسەی دەکرد. باوکەکە باسی ڕەوشی کوڕەکەی خۆی دەکرد(٧). من خۆم کە خەڵکی ناوچەکەم، ئەم ڕووداوەم بە چاوی خۆم بینی، بۆیە لێرەدا بە نموونە هێنامەوە.

هاتوچۆ لە نێوان هەولێر و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی بەعس کارێکی ئاساییە. لە هەردوو لا خەڵک دێن و دەچن. لە هەولێر عەگال بەسەر لە جاران زیاتر دەبینرێن. ئەو کاتەی لە هەولێر بووم لە یاریگەی هەولێر (کە ئێستا چاک کراوەتەوە)، یاری تۆپی پێ لە نێوان هەولێر و تیپێکی عێراقی (لام وا بێ بەغدا) دەکرا. لە تەلەفزیۆنیش یارییەکەیان نیشان دا. فەڕەنسۆ هەریری یەکێ لە ئامادەبووانی یاریگەکە بوو. خەڵک دەڵێن ناوبراو زۆر حەزی لە وەرزشە و گیانێکی وەرزشی هەیە و بایەخیش بە کاری بنیاتنانی شوێنی وەرزشی دەدات. چاککردنەوە و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی یاریگەی هەولێر بە یەکێک لە کارەکانی ئەو دەژمێردرێت. هەر لە تەلەفزیۆندا یەکێ لە ڕاهێنەر(مەشقپێکەر)ە عێراقییەکان قسەی دەکرد. دەڵێن هەر هەمان ڕاهێنەر جارێ لە جاران لە تەلەفزیۆنێکی سەر بە پارتیدا گوتبووی (شمال العراق)، ئا لەو کاتەدا فەڕەنسۆ تەلەفۆن بۆ تەلەفزیۆنەکە دەکات و، ناڕەزایی خۆیشی دەردەبڕێت بەرامبەر بە زاراوەی (شمال العراق). ناوبراو پێشنیاری بەکارهێنانی (کردستان العراق)ی کردووە.

هیچ گومان لەوەدا نییە کە حکومەتی عێراق بە هەر هۆیەک بێ هەوڵی ناردنی بەکرێگیراوانی خۆی بۆ کوردستان دەدات. کێ ناڵێ لە ڕێگای یاریکەران و مانگی سووری عێراقی و هاتوچۆکردن بەم کارە ڕانابێت؟ دەبێ ئەوەش بڵێم هەردوو حیزبە شەڕکەرەکەی خوارووی کوردستان، ئەوەندەی تاقیبی یەکتریان دەکرد، ئەگەر نیو ئەوەندەش تاقیبی سیخوڕانی سەر بە دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانیان بکردایە، دەکرێ بڵێین خزمەتێکی چاکیان بە گەلی کورد دەگەیاند. بەداخەوە وایان نەکرد و نایشی کەن!

ڕژێمی کۆلۆنیالیستی عێراق لە ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا، بە تایبەتی لە ناوچەکانی کەرکووک و مەخموور، ڕۆژانە کورد دەردەکات. گوندە کوردییەکانیش وێڕای ماڵ و موڵک و زەوی بەپیت بە عارەبەکان دەبەخشرێن. لە گوندی (عەرێنە)ی هەولێر کە هێشتا کوردی تێدا ماوە و بەناوە ڕێکخستنی پارتیشی تێدایە، خێڵە بەدوەکانی عارەبی ناوچەکە کە بە هاون و دۆشکە و چەکی سووک لە لایەن ڕژێمەوە چەکدار کراون، ڕۆژ نییە شەڕ بە کورد نەفرۆشن و گێچەڵیان پێ نەکەن. دەڵێن خەڵکی گوندەکە هەراسان بوونە و چەکدارەکانی سەر بە پارتیش فشەی سمێڵیان دێت. شایانی باسە دێی ناوبراو هەر ٢٠ کیلۆمەتر دوورە لە هەولێرەوە. لە دوایساڵی (١٩٩١)ەوە گەلێ جار کۆمەڵکوژیی لە دژی دانیشتوانی ئەم گوندە ئەنجام دراوە.

من کە لە هەولێر بووم، دەرکراوانی شاری کەرکووک لە بەردەم بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە عەنکاوە خۆپیشاندانێکیان ساز کرد. خۆپیشاندەران ناڕەزایی خۆیان لە هەمبەر سیاسەتی ڕژێم لە شاری کەرکووکی کوردان دەربڕی. پارتیش کە وەزارەتێکی تایبەتی بە دەرکراوان و ئاوارەبووان هەیە، لەسەر ناوی حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەیاننامەیەکی ناڕەزایی دەربڕینیان بڵاو کردەوە. هەروەها لە هەولێر، جگە لە پارێزگای هەولێر خۆی، هەردوو پارێزگای سلێمانی و کەرکووکیش هەن. برادەرێکی خۆم کە برادەری نزیکی پارێزگاری کەرکووکی بنکە لە هەولێرە، لە سەردانێکیدا بۆ کوردستان، چاوی بە جەنابی پارێزگار دەکەوێ و لێی دەپرسێت: ئێوە وەک پارتی چ کارێکی فشار خستنە سەر دەوڵەتی عێراقتان لەمەڕ مەسەلەی کەرکووک بە دەستەوەیە؟ کاکی پارێزگار کە دوای دوو جار دووبارە کردنەوەی پرسیارەکە ئینجا حاڵی دەبێت، لە وەرامدا دەڵێت: ئەگەر ڕاستیت دەوێ هیچ!

ئێمە کە کەرکووک وەک نموونە دێنینەوە، ئەی چی لە ناوچە کشتوکاڵییە بەپیتەکانی قەراج و کەندێناوە و شەمامک بکەین؟ ئەی قەرەچووغ و کاولە مووسڵ و ژەنگار و شوێنەکانی دیکە چ لێ بکەین؟ ئەگەر کورد خۆیان ئەم شوێنانەیان لەبیر کردبێ، دەبێ دوژمنان چ پیلانێکیان بەدەستەوە بێ؟ تەنانەت بەناو هێزی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیش هەر کە مەسەلە هاتە سەر کەرکووک، هەر لە ئێستاوە، خۆیان دێن و دەبەن و دەشڵێن: چارەنووسی شاری کەرکووک دوای هاتنە سەر کاری حکومەتێکی دیموکراتی، بە دەنگدان، لە پاشەڕۆژ و لە لایەن خەڵکی عێراقەوە دیاری دەکرێت. ئەو کاتە دەتوانین بڵێین کەرکووک شارێکی کوردییە یان نا؟! (٨)

هەتا خۆخۆر بین و سەرانیش گاڵتە بە ئێمە و جیهانیش گاڵتە بەوان بکات، نەک هەر ئەو شوێنانەی کە ناومان بردن، بگرە کوردستانیش بێ خاوەن دەمێنێتەوە. لەخۆڕا نییە ڕۆماننووسی بەرچاوی کورد عەزیزی مەلای ڕەش لە دەسپێکی دوا بەرهەمی خۆیدا دەنووسێت: پێشکەشە بە کەندێناوەی داگیرکراو..و..بێ خاوەنەکەم(٩).

تا ئێستا زۆر شت لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان پارتی و بەعس نووسراوە و گوتراوە. هەمووشمان کەم تا زۆر ئاگاداری ئەو پەیوەندییانەین کە لە نێوان هەردوو هێزە دەسەڵاتدارەکەی خوارووی کوردستان و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا هەیە. بۆیە لێرەدا من هەر بەم چەند دێڕە واز لەم بابەتە دێنم.

## دەنگ و سەدای ئاشتبوونەوە لە کوردستاندا

پاش ئەوەی کە ملیۆنەها کورد نەیتوانی تەوقە بە جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانی بکات. دوای ئەوەی کە خەڵکی ڕەش و ڕووتی کوردستان گەروویان دڕا و بە قسە و بە کردار داوایان لەم دووانە کرد تا ئاشت ببنەوە. ڕۆشنبیر و ڕووناکبیری کورد نەما کە بەیاننامە لە دوای بەیاننامە دەرنەکەن و ناڕەزایی خۆشیان لە هەمبەر شەڕی کوردکوژی دەرنەبڕن. لە دوای ئەم هەموو داواکاری و پاڕانەوە و خۆ بە قوربان کردنە، لەسەر شاشەی کەناڵە تەلەفزیۆنییە جیهانییەکان، چاومان بە هەردوو ئاغای شەڕ کەوت کەوا چۆن شتان بۆ یەکتر پینە دەکەن. بینیشمان کە تەنیا ئیشارەتێکی مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بەس بوو بۆ ئەوەی مامە و کاکە، بە نادڵییش بێ، تەوقە لەگەڵ یەکدی بکەن.

جەماوەری ستەمدیدەی کوردستان بە هەر تەقەوەستان و پێکهاتنێکی نێوان ئەم دوو عەزیای شەڕە دڵیان دەکرێتەوە. ئەمە شتێکە گومانی لێ ناکرێت و هەموو کەسێکیش دەیزانێت. لێ..بەڵێ ناسۆرەکانی ئەم شەڕە لەعنەتییە ئەوەندە بە ئاسانی ساڕێژ نابنەوە. چوار ساڵ لە یەکتر کوشتن و ڕک و کینەیەکی دەیان ساڵ درێژ، ساردبوونەوەیان کاتێکی باشی گەرەکە.

سەرەڕای تەوقەکردنی جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانیش، ڕەوشی کوردستان هێشتا بەم جۆرەی خوارەوە بوو (تا ئەو کاتەی من لەوێ بووم): کۆبوونەوەی هەردوو لا لە سەلاحەدین و هەولێر، سەردانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی بۆ هەولێر(نانخواردنیان بە یەکەوە لە قەسری نازە کە بە قسەی برایەکی کەرکووکیی ئاگادار لە مەسەلەکە، نانخواردنەکە ٨٠٠٠ دیناری تێچووە. دەبێ ئەوەش بڵێین تەنیا چوونە ژوورەوەی چێشتخانە و قەسری نازە ٧٥ دیناری عێراقی دەوێت)، گەشتکردن لە نێوان ناوچەکانی هەردوو لادا لە جاران ئاسانتر بووە (هەر دەبێ کاخەز یا مۆڵەتی ئاسایشت هەبێ)، شەڕی ڕاگەیاندن ڕاگیراوە

(ئێستا هەر بەڕێز بەڕێز لە ئارادایە)، بە هیچ شێوەیەک ڕێگە بە چەکدارانی هەردوو لا نادرێت ئەملا و ئەولا بکەن، لەنێو خەڵک زۆر باسی ئەوە دەکرا کە ئەم جارەش پ.ک.ک بە یەکێتی و پارتی بە لێدان دەدەن، جار بە جار وردە شەڕ لە نێوان یەکێتی و پارتی دەقەوما، ئاوارەبووان و دەرکراوانی هەردوو لا هێشتا نەیاندەوێرا بگەڕێنەوە سەر ماڵ و موڵکی خۆیان، لایەنگرانی یەکێتی لە هەولێر (هەڵبەت ئەمە بۆ سلێمانیش ڕاست دەردەچێت) نەیاندەوێرا بە ئاشکرا ڕای خۆیان لەناو خەڵکدا دەربڕن،...هتد.

## مەسعوود بارزانی دێتەوە کوردستان

مەسعوود بارزانی لە پاش گەشتە زۆر سەرکەوتووانەکەی بۆ ئەورووپا و ئەمریکا(١٠) هاتەوە کوردستان. شێوەی پێشوازی کردنی مەسعوود بارزانی هەر لە شێوەی پێشوازی کردنی سەرۆکی دەوڵەتێک دەچوو. لە سەرەتادا سەرۆک وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان/هەولێر، ڕۆژ نووری شاوەیس، پێشوازییەکی گەرم و گوڕی لە مەسعوود بارزانی کرد. لە پاشان هەردووکیان بە یەکەوە وەستان تا سروودی تایبەت بە پارتییان بۆ لێبدرێت (نەک سروودی نیشتمانیی کوردستان/ئەی ڕەقیب). مافوورێکی درێژی سوور لەسەر زەوی ڕاخراوە. لە تەنیشت مافوورەکەش کۆمەڵێک چەکدار، لە شێوەی پاسەوانی شەرەف، بە جل و بەرگی سەربازیی ڕەنگ سوور و ڕەشەوە لە ئامادەباشییەکی تەواو دان. مەسعوود بارزانی و ڕۆژ نووری شاوەیس بەسەر مافوورە سوورەکەدا هەنگاو دەنێن. مەسعوود بارزانی لەبەردەم ئاڵای زەردی پارتیدا (نەک ئاڵای کوردستان) سەر دادەنوێنێ. وێڕای سڵاوی سەربازیی کۆمەڵی چەکداران، مەسعوود بارزانی لە لایەن گەورە لێپرسراوانەوە تەوقەی لەگەڵ دەکرێت. هەر لە مەسیف و هەولێرەوە هەتا دهۆک و زاخۆ، هەروەک سەردەمی بەعس، لە قوتابخانە و دایەرە ڕەسمییەکان خەڵکیان کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بەخێرهاتنەوەی سەرۆک مەسعوود بارزانی بکەن. کۆمەڵە خەڵکێکی وابەستە بە پارتی و سەرۆک مەسعوود بارزانی لە پێشەوە دانراون تا هاوار بکەن: بۆیە پێت دەڵێن کاکە چونکە ڕابردووت پاکە(؟!). ئۆتۆمۆبیلی لاندکرۆزەری سپی و نوێ نوێ لەدوو یەکتر ڕیزیان بەستووە. لە هەولێر بەمانە دەڵێن (چێرەبەکەر=مانگا کە بە کەڵ دێت). خەڵکیش لەمبەر و لەوبەری شەقام وەستێنراون تا سڵاو لە سەرۆکی هێژا بکەن. نوێنەری حیزب و ڕێکخراوەکانی هەولێریش ئامادەن. هەندێکیان بۆ تەلەفزیۆن دەدوێن. یەکەمین قسەی مەسعوود بارزانی بۆ تەلەفزیۆن بەم جۆرە بوو: هەڵبەت، دوای ماوەیەکی زۆر لێرە نەبوون، گەڕانەوە بۆ کوردستان شتێکی زۆر خۆشە. من گەشبینم. دوارۆژێکی گەش چاوەڕوانی گەلی کورد دەکات.

لە تەلەفزیۆنەکانیش (سروودی بارزانی) لێ دەدرێ. هۆنراوەی ئەم سرووده لە لایەن هاوتا ئەسعەدەوە هۆنراوەتەوە. گوتنیشی هەر هاوتا ئەسعەد و کچێکە بە ناوی هۆزان.

یەک دوو ڕۆژ دواتر مەسعوود بارزانی دێتە هەولێر(پەرلەمان). جەوهەر نامیقی سەرۆکی پەرلەمان دەڵێت: "با بەڕێزیان بفەرموون". ئەندامانی پەرلەمان دانیشتوون. مەسعوود بارزانی لە قسەکانی خۆیدا جەخت لەسەر ئاشتی دەکات. هەروەها دەڵێت: "دەبوایە ئێمە لە کوردستان لەگەڵ یەکتر ڕێک بکەوتایەین، ئینجا بەرەو ئەمریکا و دەرەوە بچووبایەین". لە هەمان کاتدا باسی ڕۆڵی ئەمریکا دەکات و لەبیریشی ناچێت پارتی کرێکارانی کوردستان بە حیزبێکی تیرۆریست ناوزەد بکات.

خەڵکیش، ئەوانەی کە دڵیان خۆشە، بە ئاشکرا دڵخۆشیی خۆیان دەردەبڕن. خەڵکێکی بە ڕادده زۆریش لەسەر بێدەنگیی خۆیان بەردەوامن و قسان ناکەن. دەکرێ بڵێین زۆربەی هەرەزۆری خەڵکەکە لە چاوەڕوانی دان و بیر لە هەنگاوی داهاتوو دەکەنەوە.

## سەبارەت بە ڕاگەیاندنی پارتی

کۆمەڵناس و نووسەری بەناوبانگی تورک، هەروەها دۆستی گەورەی کورد د. ئیسماعیل بێشکچی، لە یەکێ لە وتەکانی خۆیدا، ڕاگەیاندن و مەدیای تورک بە شاخێک لە دەزگای ئیستیخباراتی تورک (میت)، دەزانێت. لای ناوبراو ڕۆژنامە و ڕادیۆ و کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی تورک گوێ و چاوی سوپای تورکن. هەر شتێک سوپای تورک بیەوێت، ئەوان بە تێروتەسەلی دەینووسن و بڵاوی دەکەنەوە. بە کورتییەکەی ئەوان بەکرێگیراو و ئەڵقەلەگوێی تاقمی سەربازیی تورکن.

ئەمە سەبارەت بە مەدیا و ڕاگەیاندنی تورک. خراپ نابێ گەر لێرەدا کەمێک لەبارەی ڕاگەیاندنی پارتیش بدوێین. بەر لە هەر شتێک دەمەوێ بڵێم: وێڕای زۆریی ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، بە تایبەت ئەوانەی سەر بە پارتین، مرۆڤ هەست بە جۆرە نامۆبوونێک دەکات. مرۆڤ وا هەست دەکات کە ئەم دەزگایانە وەک بڵێی هی کورد نین. تەلەفزیۆن و دەزگای گوڵان زیاتر شێوەی پڕوپاگەندە لە خۆیان دەگرن. بە قسەی خەڵک تەلەفزیۆنی گوڵان هی نێچیرڤان بارزانییە و ئەو لە پشت پەردەوە بەڕێوەی دەبات. هەرچی (Ktv)یە سەر بە فەرەنسۆ هەریریی پارێزگاری هەولێرە. من ئەمانەم لە خەڵک بیستووە. هەرێمی کوردستانیش خاوەن تەلەفزیۆنی خۆیەتی.

زمانی ڕاگەیاندنی پارتی، جێگای داخە دوای پەنجا ساڵ لە دروستبوونی ئەم حیزبە، زمانێکی کاڵ و کرچە. وشەی عارەبی زۆر بەکار دەهێنرێت. خۆیان لە هەندێ بوار دەبوێرن. لە هەواڵەکانیان دەڵێن: بە پێی ڕۆژنامەی (حوڕیەت)ی تورکی. وەک لە سەرەوە بینیمان مامۆستا بێشکچی چ بە ڕاگەیاندنی تورک دەڵێت، کەچی دەزگای ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، وەک سەرچاوە، پشت بە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکانی تورک دەبەستێت. تۆ بڵێی کارمەندانی دەزگای ڕاگەیاندنی پارتی نەزانن کە قسە و هەواڵەکانی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانی تورک زۆربەی هەرەزۆریان درۆ و دەلەسەی پڕوپووچن.

لەمانەش گەڕێ. هەر کە سەیری کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی پارتی و هەندێ لە حیزبەکانی دیکەی ناو باخەڵی پارتی دەکەیت، بە خۆشت نازانی تەماشای کەناڵێکی تەلەفزیۆنیی تورکی - عارەبی - فارسی دەکەیت یان کوردی. ڕۆژ تا ئێوارێ لەم تەلەفزیۆنانەدا گۆرانی تورکی (بە پلەی یەکەم) و عارەبی (بە پلەی دووەم) و فارسی (بە پلەی سێیەم) لێ دەدرێت. تەنانەت مێشکی خەڵکەکەشیان بەم جۆرە گۆرانییە بەرباد و خراپانە ئاو داوە. شۆخەکیژ و کوڕەلاوی کوردیان فێرکردووە داوای گۆرانی بێگانە بکەن. لە کوردستانی ئازاددا ڕۆژ ڕۆژی سەحەر و ئیبراهیم و نەجوا کەرەم و سەمیرە سەعید و کوچوک ئەمرە و ساهیر کازم و...گۆرانیبێژەکانی دیکەی تورک و عارەب و فارسن. ئەگەر چوویتەوە هەولێر، لەبیرت نەچێ سەرێک لە تۆمارخانەکانی هەولێر و باخی گڵکەند و شەربەتفرۆشەکانی شار بدە، تاکو ڕاستی قسەکانی منت بۆ دەرکەوێت. هەڵبەت سەیرکردنێکی تەلەفزیۆنەکانیش کارەکەت سووکتر دەکات. نابێ ڕۆڵی کەناڵە تەلەفزیۆنییە جیهانییەکانیشمان لەبیر بچێت، کە بە باش و خراپ، کار لە بیرکردنەوە و مێشکی بینەران دەکەن. لە کوردستانیش ئامێری پەڕەبۆڵ بە ئاسانی دەست دەکەوێت و ئێستا زۆر کەس، بە هەر هۆیەکەوە بێ، خەریکی کڕینی پەڕەبۆڵە. لە هەولێر بەم ئامێرە دەڵێن (سەحن). دیارە زیاتر مەبەستیان لە سینییەکەیە.

پارتی لە ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕاگەیاندن و دەزگا ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنییەکانی خۆیدا، تورک ئاسا، ئامانجی یەکەمی دژایەتیکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو (بە تایبەت ئەو ماوەی من لە کوردستان بووم). تەماشاکردنێکی خێرای تەلەفزیۆنەکانی پارتی بەسە بۆ باوەڕکردن بەم قسەیەم. لە تەلەفزیۆنی گولاندا ئەم جۆرە زاراوانە بەکار دەهێنران: تیرۆریستەکانی پ.ک.ک، تیرۆریستی مەزن، دیارە مەبەست لە عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی (پ.ک.ک)یە، کارە تیرۆریستییەکانی پ.ک.ک، بازرگانی کردن بە حەشیشە و هیرۆین لە لایەن (پ.ک.ک)ەوە،...هتد. ئێمە هەموومان دەزانین کێن ئەوانەی کە ئەم جۆرە زاراوانە بەکار دێنن. بێگومان دەشزانین پارتی لە کێ فێریان بووە.

هەر لە تەفزیۆنەکانی پارتیدا چاوپێکەوتن بۆ نموونە لەگەڵ کابرایەکی وەکو سەلاح بەدرەدین ساز دەکرێت. ناوبراو کە خەڵکی باشووری بچووکە، هەر لە مێژە سەنگ و ڕەنگ و دەنگی لەو بەشەی کوردستاندا نەماوە. لێ.بەڵێ ئامادەیی ئەوەی تێدایە بە کوردی و بە عارەبیش زیاتر لە نیو سەعات بە شان و باڵی پارتیدا هەڵبڵێت و بێگومان لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستانیش قسەی ناشیرین و نابەجێ بکات. بەرنامەی (گەشتێک بەناو گوندە لاتەریکەکاندا) شتێکی دیکەیە بۆ پیسکردنی ناوی پ.ک.ک. من خۆم قەت قەت دڵنیا نیم لەو وێنە و شتانەی کە نیشان دەدران، هەر هەموویان ڕاست بن. ڕێی تێدەچێ برێکیان لە ڕاستییەوە نزیک بن، بەڵام ماڵم قەبرە هەندێکیان فریان بە ڕاستییەوە نەبوو. مەسەلەکە زیاتر پروپاگەندەکردن بوو هیچی دیکە نا!

دەگرێ بپرسین پەیکەری نووسەری گەورە و شەهیدی نەمری کورد مووسا عەنتەر چ پەیوەندییەکی بە پارتی کرێکارانی کوردستانەوە هەبوو، تا لە مانگی ئۆکتۆبەری ئەمساڵدا(١٩٩٨) لەبنەوە هەڵیتەکێنن و لە سووچێکی حەوشەی هۆڵی میدیادا هەڵیپەسێرن؟! خۆ ئایێ مووسا شەهیدی هەموو کوردستان بوو نەک هی پارچە و لایەن و ڕێکخراوێکی تایبەتی کوردستان؟!. ئایا ڕەوایە بۆ پارتییەکی تەمەن ٥٠ ساڵە کە چاوی بەرایی نەدات پەیکەری شەهیدێ ببینێت؟! داخوا دەبێ نەتەوەی کورد چاوەڕوانی چ لە پارتییەکی وەها بکات؟! تۆ بڵێی بڕیاری هێشتنەوەی پەیکەری شەهیدێکیشیان لە دەستدا نەمابێ؟!

پارتی لە گۆڤاری (گولان العربی)دا چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کوردۆ و ناڵین و لوتفی باکسیدا کردووە. کوردۆ دەڵێت: "گومان لەوەدا نییە کە پ.ک.ک هەر لە ساڵی (١٩٨٤)ەوە تا ئێستا زەرەری گەورە گەورەی لە کورد داوە"(١١). هەر لە شوێنێکی دیکەی چاوپێکەوتنەکەدا دەڵێت: "ئەگەر گیروگرفتی پ.ک.ک کۆتایی پێ نەیەت، ئەوا چارەسەرکردنی گیروگرفتی کورد لە ئەورووپا و کوردستانیش لە توانادا نابێت"(١٢).

هەر لە هەمان ژمارەی گۆڤاری ئاماژەبۆکراودا ناڵین باکسی کە خوشکی کوردۆ باکسییە و هەردووکیشیان منداڵی لوتفی باکسین، بە یەکێ لە بەناوبانگترین ئەو ١١ ژنانەی جیهان دانراوە و، لە شوێنێکیشدا وێنە و ناوی ژنەکان بەرچاو دەکەون کە ئەمانە هەندێکیان: شازادە ڤیکتۆریای سوید، وینی ماندێلا، شازادە دایانای کۆچکردوو، ئاستريد ليندگرێنی نووسەری منداڵانی بەناوبانگی سویدی و جیهان، گودروون شیمانی سەرۆکی پارتی چەپی سویدی(١٣). نازانم گۆڤاری (گولان العربی) لە چ سەرچاوەیەک ئەم شتەی هێناوەتەوە، چونکە ناوی سەرچاوەکە نەنووسراوە. خۆزگە ناڵین باکسی وەک ئەو ژنانەی کە ناویان هاتووە دیار و بەرچاو و بەناوبانگ بوایە و بە چ شێوەیەکیش سڵی لە خزمەتکردنی گەلەکەی نەکردایەتەوە.

تەلەفزیۆنەکانی هەولێر، بە تایبەتیش ئەوانەی سەر بە پارتین، هەر شتێک لە (Med-tv) ەوە وەربگرن، لەبەر چاوی خەڵک هێماکەی تەلەفزیۆنی ناوبراو ڕەش دەکەنەوە. ئەوان زیاتر گۆرانییەکان وەردەگرن، چونکە بە بڕوای خۆیان پێویستییان بە بەرنامە جیاجیاکانی تر نییە. لە کاتێکدا کە ڕۆژ تا ئێوارە گۆرانی و فلیمی عارەبی لە کەناڵە تورکی و عارەبی و تەنانەت جیهانییەکانیش دەگوێزنەوە، لە زۆر باریشدا هێماکانی ئەو کەناڵانە ڕەش ناکەنەوە. دیارە ئەم یاساییان تەنیا و تەنیا تاکە تەلەفزیۆنی ساتیلایتی کوردان Med-tv دەگرێتەوە. جاری وا بووە تەلەفزیۆنێکی غەیرە پارتی شتێکی لەمەڕ پ.ک.ک بڵاوکردۆتەوە، لەسەر ئەمە، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ کاری پەخشی ئەو تەلەفزیۆنەیان وەستاندووە.

لەم دواییانەدا، لە ئەورووپا بۆ تاقیکردنەوە تەلەفزیۆنی ساتیلایتی Ktv بۆ ماوەی دوو کاتژمێر بڵاو دەبێتەوە. وەک کوردێک هەڵوێستی من وەهایە: هەر تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و گۆڤار و دەزگایەکی کوردی، ئەگەر لە پێناوی خزمەتکردن بە گەل و نەتەوە و نیشتمان دەست بەکار بن، ئەوا لە کانگای دڵمەوە گەرمترین پیرۆزباییان لێ دەکەم و هیوای سەرکەوتنیشیان بۆ دەخوازم. بە پێچەوانەی ئەمەش ئەنجامەکەی هەر لەناوچوون و ڕیسوابوون دەبێت.

## سەبارەت بە Med-tv

گومان لەوەدا نییە هەر کەسێک لە کوردستان کە خاوەنی پەرەبۆڵ بێت سەیری Med-tv دەکات. وەک پێشتریش باسم کرد ئێستا خەڵک بە ئاسانی دەتوانن پەرەبۆڵ بە دەست بخەن. نرخی پەرەبۆڵ دەوروبەری ١٠٠٠-٢٠٠٠ دیناری عێراقی دەبێت. زۆر لە لێپرسراوانی خودی پارتی سەیری Med-tv دەکەن. ئەوانیش دەیانەوێ بزانن ئەم کەناڵە تەلەفزیۆنە کوردییە چ دەڵێت و چ ناڵێت. ئەوەش هەر باشە! من خۆم لە ماڵێکی سەر بە پارتی بۆم لواوە یەک دوو جار تەماشای Med-tv بکەم. دەر و دراوسێی ماڵەکەش دەهاتن تا سەیری کەناڵی Med-tv بکەن. ئەو ماڵە کوڕێکیان پاسەوانی تایبەتی لێپرسراوێکی گەورەی پارتییە. برادەرێکی خۆشەویستم هەیە هەموو جارێ دەڵێت: من دڵخۆشم بەوەی ئەگەر ژن و منداڵی لێپرسراوێکی پارتیش سەیری Med-tv بکەن، چونکە ئەمە بەسە بۆ وشیارکردنەوەی تەواوی خێزان و ماڵەکە.

ئەوەی شایانی باسە تەنیا دوو مانگ بەر لە چوونەوەم، بە قسەی خەڵکی هەولێر خۆیان،لە هەندێ گەڕەکی شاردا ئاسایش بە ماڵان کەوتبوون تا بزانن خەڵک لە کەناڵی Med-tv دەڕوانن یان نا. تۆ بڵێی زەرەری Med-tv لە هی کەناڵە تورکییەکان زیاتر بێ؟!

لە خوارووی کوردستان بینەرانی Med-tv جۆراوجۆرن. بەشی هەرە گەورەی بینەران تەماشای ئەو بەرنامانە دەکەن کە بە کرمانجی خواروون و لە هەمان کاتیشدا سەبارەت بە ڕەوشی سیاسیی کوردستانن. بەشێکی دیکەی بینەران حەزیان لە ئاواز و گۆرانی و ئەو بەرنامانەیە کە شێوەی ئاهەنگ و مۆسیقایان بە خۆوە گرتووە. بێگومان خەڵکیش هەن گازندە و گلەیی لە Med-tv دەکەن، چونکە زۆر جاری وا دەبێت پرۆگرامەکانیان بە زمانی تورکی دەبێت کە هیچی لێ تێناگەن (بە تایبەتی بەرنامە سیاسییەکان). ئەوەی لێرەدا گرنگە دۆست و دوژمن بە یەکەوە تەماشای Med-tv دەکەن. لەوەش گرنگتر سەرەڕای هەموو ئاستەنگ و کۆسپێک خەڵکی کوردستان شەیدای (Med-tv)ن و بە تەلەفزیۆنی خۆیانی دەزانن.

## یەک دوو قسە لەسەر تورکمانەکان

لێرەدا دەمەوێ چەند شتێک باس بکەم کە پەیوەندییان بە تورکمانەکانی هەولێرەوە هەیە. بە قسەی دانیشتوانی هەولێر تورکمانەکان لوویتان تا بڵێی بە ئاسماندا چووبوو و سڵاویان لە کەس نەدەکرد و بەرێی خۆشیان نەدەبینی. لە هەر گەڕەک و کۆڵانێکدا بنکە و بارەگایان دانابوو. ژمارەی بارەگاکانیان گەیشتبووە ٧٧. خەڵک لێیان دەهری بووبوون. شەوێک بە ئاسایش و خەڵکی هەولێر لە تورکمانەکان بەربوون و زۆربەی بارەگاکانیان بێ داخستن. هەر بە قسەی خەڵک لە هەمان شەودا پارتی لە لێپرسراوانی تورکمانەکان دەگەڕان تا ئاشتیان بکەنەوە. دەڵێن، لە تەلەفزیۆن، فەرەنسۆ هەریری لە قاڵدرمەکەی بەردەم پارێزگاش هاتە خوارەوە تا لێپرسراوە تورکمانەکان بەرێ بکات. بەرپرسیارێکی تورکمانەکان ناوی (ئایدن)ە و کاتی خۆی لە دایەرەی کارەبای هەولێر ئیشی دەکرد. یەکێکی تریان ناوی مامۆستا فوئادە و لە خانەی مامۆستایانی کوڕان مامۆستای خۆم بوو. ئەوکات مامۆستایەکی سمێڵ زەردی بێدەنگ و سەنگین بوو.

پارتی لەژێر فشاری تورکیا زەرەر و زیانی بۆ تورکمانەکان ژمارد. بارەگاکانیان کرانەوە، بەڵام هەر بە قسەی خەڵک تەنیا ٧ بارەگایان هەیە (بۆ من جێگای پرسیارە و دواتر دێمە سەری). چەکدارەکانیان بە بێ چەک بۆیان هەیە لەنێو بازاڕدا بسووڕێنەوە. ئەو کاتەی لە هەولێر بووم دوو بۆمبا لە بارەگایەکیاندا تەقیەوە (بارەگاکەی بەرامبەر قەسری شیمال/سەر ڕێگای ئیسکان). من خۆم دیوارە رووخاوەکەی سەر جاددەم بینی کە چاکیان دەکردەوە. گوایە تورکمانی (ڕەفیق حیزبی)ی سەر بە بەعس لە کەرکووکەوە دێن و ئەو کارانە ئەنجام دەدەن. کێ دەڵێ ئەمە ڕاستە؟!

خەڵکی هەولێر زۆر دڵیان بە لێدانی تورکمانەکان خۆش بوو. ئەوان دەڵێن هەر نا بۆ جارێکیش بێ تەمێ کران. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت هێزی ئاشتیی ساختە بنکە لە هەولێر کە بارەگایەکی تا بڵێی زلیان هەیە، بە ڕاددەیەکی زۆر تورکمانەکانی تێدایە و لەسەر بارەگاکەشیان بە خەتی درشت نووسراوە: P.M.F، ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم کورتکراوەی (Peace Maker Forces)ە، کە بە مانای "هێزەکانی دروستکەری ئاشتی" دێت (ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی).

سامی عەبدولڕەحمان لە دانیشتنێکدا لە (Kista Träff)ی ستۆکهۆڵم، لە سەرەتای مانگی ئۆکتۆبەری ئەمساڵدا (١٩٩٨)، سەبارەت بە ڕووداوی لەمەڕ تورکمانەکان گوتی: ئەمە (**نقمة الجماهیر**)ە(١٤).

سەرەڕای ئەمانە هەمووشیان، با بڵێین تورکمانەکان تەنیا ٧ بارەگای چەکدارییان لە هەولێر ماوە، ئەی چ لەو هەموو دام و دەزگا و قوتابخانە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و کۆلێژی ئیشقی نموونەیی و نیلۆفەر و باخچەی ساوایان و...هتد، بکەین. لە تەلەفزیۆنەکانی خۆیاندا بە تورکی و کوردی و عارەبی ڕۆژانە پروپاگەندە بۆ تورکیا و زمانی تورکی دەکەن. دەڵێن: بۆ ئەوەی لە پێشهاتەکانی سەردەم ئاگادار بیت، بۆ ئەوەی فێری زمانێکی هاوچەرخ بیت، تەنیا و تەنیا خۆت لە بەشی زمانی تورکی/پەیمانگەی ناوەندیی مامۆستایان ناونووس بکە. ئەمە تەنیا وەک نموونە یەکێک لە پروپاگەندە و ڕێکلامەکانیانە. لە باخچەی ساوایان منداڵی کوردیش فێری زمانی تورکی دەکەن. جێگای داخە کەسانێکی کورد هەن بە دەست ماچکردن منداڵەکانیان لەو شوێنانە وەردەگیرێن. قوتابخانەکانیان بە قسەی خەڵک لە ٢٠دانەشی تێپەڕ کردووە.

بە بڕوای من ئەمانە هەموویان زەنگی خەتەرن بۆ سەر کولتوور و داب و نەریت و ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد و کوردستان. لەسەر هەر کوردێکی نیشتمانپەروەر و خەمخۆریش پێویستە بە هەندیان هەڵبگرێت و لە مەترسی و خەتەرناکییان تێ بگات. تورکیا بە هۆی چەند تاقمێکی خۆفرۆش و کوردستانفرۆشەوە، ئەوەی نەتوانێت بە جەنگ بیکات، دەیەوێ بە شێنەیی و لەسەرخۆ ئەنجامی بدات.

## هەندێ سەرنج لە بارەی پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵان

هەموومان دەزانین یەکێک لە قوربانییە هەرە بەرچاوەکانی شەڕ و بشێویی ناوخۆیی منداڵانن. ئاکام و کارەساتەکانی شەڕ بە گەلێ شێوە کار لە باری ژیان و پەروەردە و فێرکردنی منداڵان دەکەن. شەڕ منداڵان بێ باوک و بێ دایک و بێ ناز دەکات و ئەوان



وێنەی منداڵان و مامۆستایەک.

*"زۆر منداڵی قوتابخانە توشی نەخۆشی تراخوما دەبێت کە دەبێتە هۆی کوێریی. ئەم نەخۆشییە ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی بیسوپێخڵییە. پرۆژەی قەندیل منداڵەکان و مامۆستا فێر دەکات کە چۆن ڕێگا لەم نەخۆشیانە بگرن. مامۆستاکان خۆیان فێری ئەوە دەکەن چۆن چارەسەری ئەو منداڵانە بکەن کە توشی تراخوما دەبن. ژمارەی ١٦٠٠٠ منداڵ فەحس کراوە."*
سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان بە سویدیی، ژمارە:١٩٩٦/٤.

لە سادەترین مافەکانی خۆیان بێ بەش دەکات.

لە خوارووی کوردستان، لە ئەنجامی شەڕ و پێکدادانەکانی نێوان یەکێتی و پارتی و لایەنە جوداکاندا منداڵان تووشی زۆر کارەسات و گیروگرفت هاتوون. ئەوەی کە زیاتر لێرەدا دەمەوێ باسی بکەم خاڵێکە پەیوەندی بە سیستەمی خوێندن و کتێبی قوتابخانەکانەوە هەیە. قوتابیانی کورد لە قوتابخانەکانی باشووری کوردستاندا هێشتا لەسەر هەمان شێوە و دەستووری پەروەردە و فێرکردنی سەردەمی بەعس بەردەوامن. کەرەسە و کتێبی قوتابخانەکان هەر هی ئەو کاتانەن کە لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە چاپ کراون. لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکاندا هێشتا وێنەی (هاوڕێی تێکۆشەر و سەرۆکی فەرماندە سەددام حوسێن خوا بیپارێزێت) دەبینرێت. لە هەمان کاتدا ئاڵا و نەخشەی عێراق و نیشتمانی عارەبیش هەن. ناوەڕۆکی وانەکان منداڵانی کورد بە عێراق دەبەستنەوە. ئەوان دەکەن بە عێراقی نەک کوردستانی و دانیشتوانی کوردستان. فێریان دەکەن عێراقیان خۆش بوێت نەک کوردستان.

لەبەر کەمیی کتێب، جاری وایە بە سێ قوتابی کتێبێکیان هەیە و بە نۆرە دەیخوێننەوە. لێ لە هەمان کاتدا کتێبی قوتابخانەکان، هەر بۆ نموونە لەسەر شۆستەی شەقامەکەی لای قەڵای هەولێر دەفرۆشرێنەوە. دەکرێ بپرسین: ئەو کتێبانەی کە دەفرۆشرێنەوە لە کوێ هاتوون و لە کوێ چاپ کراون؟ ئاشکراشە کە پارەی ڕۆژانەی شەڕێکی نێوان هەردوو حیزبە دەسەڵاتدارەکە بە هەزارەها کتێبی پێ چاپ دەکرا.

زۆر گوندی کوردستان هەن کە هێشتا بێ قوتابخانەن یان بێ مامۆستان. لە هەندێ باریشدا مامۆستایان هەیە، بەڵام مامۆستاکان ناچنە سەر کار. ئەمە چۆن دەبێت؟ بۆ نموونە: مامۆستایەک کە تازە خۆی نەقڵی قوتابخانەی گوندی (قووچەبڵباس)ی دەوروبەری هەولێر کردبوو، کە لێیم پرسی: تۆ لە شاریت، بۆچی دەتەوێ لە دێیەک کار بکەیت؟ بێ پێچ و پەنا گوتی: هەر کاتێ بمەوێ دەوام ناکەم! ئەمە لە کاتێکدا قوتابیانی گوندی (گۆسکە)ش، بە پێیان یەک سەعات ڕێ دەبڕن، هەر بۆ ئەوەی لە قوتابخانەکەی قووچەبڵباس شتێک فێربن. جێی خۆیەتی ئەوەش بڵێم کە هەندێک مامۆستا هەن تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ هەر سەددام بە سەرۆک و عێراق بە نیشتمانی خۆیان دەزانن. بە هەردوو گوێچکەکانی خۆم لەم جۆرە مامۆستایانە قسەی لەم بابەتەم بیستووە. دەبێ ئەو مامۆستایانە چ فێری قوتابیان و منداڵانی کورد بکەن؟! بەڕێوەبەری واش هەن بەرمیلە نەوتی تەرخانکراو بۆ قوتابخانەکان گل دەدەنەوە و لە بازاڕ دەیفرۆشنەوە.

لەم باسەدا، وەک نموونە، یەکێ لە کتێبەکانی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی دێنینەوە، کە لە لایەن (وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستانی عێراق)یشەوە چاپ کراوە. ناوی کتێبەکە: کتێبی زمانی عارەبی بۆ پۆلی پێنجەمی سەرەتایی، تایبەت بەو قوتابخانانەی کە خوێندنی کوردی دەیانگرتەوە لە هەرێمی کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری/هەولێر ۱۹۹۷زایینی - ۱٤۱۸کۆچی.

گوایە کتێبەکە دەستی تێ وەردراوە و هەندێ گۆڕانکاری تێدا کراوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕەوشی قوتابیانی کورد لە (هەرێمی کوردستان) بگونجێت. من تەنیا دەست بۆ چەند شوێنێکی کتێبەکە درێژ دەکەم و، بە نموونە بۆ خوێنەران باسیان دەکەم(۱٥).

لە لاپەڕە (۱٥)دا وانەیەک بە ناوی (زاخۆ) هەیە. ڕستەی یەکەمی وانەکە وەها دەست پێ دەکات: **زاخو مدينة جميلة من مدن عراقنا العزيز.** واتە: **زاخۆ یەک لە شارە جوانەکانی عێراقی خۆشەویستمانە** . لە لاپەڕە ۳٥-۳٦ دا وانەیەک بە ناوی (لە نێوان دارخورما و دارگوێزدا) هەیە. دوای ئەوەی دارگوێز دەڵێت خەڵکی هەرێمی کوردستانە، دارخورما لێی دێتە وەرام و پێی دەڵێت: **نحن من وطن واحد هو العراق الحبيب، أنت من شماله، وأنا من جنوبه.** واتە: **ئێمە خەڵکی یەک نیشتمانین کە عێراقی خۆشەویستە، تۆ لە باکووری و منیش لە باشووری.** لە لاپەڕە ٥٥-٥٦دا لە وانەیەکی تایبەت بە شاعیرەکانمان باسی (بێکەس)ی شاعیر کراوە و بە شاعیرێکی کوردیی نیشتمانی ناو براوە. لە لاپەڕە ٥٦ی هەمان وانە سەبارەت بە بێکەس گوتراوە: **أحب وطنه العراق و شعب العراق.** واتە: **ئەو عێراقی نیشتمانی خۆی و گەلی عێراقی خۆش دەویست.** دیسان لە لاپەڕە ٦٤ لە وانەی (جەژنی نەورۆز)دا هاتووە: **يستقبل العراقيون عيد نوروز، بفرح و سرور. و تبدأ إحتفالات نوروز، في عراقنا العزيز، في الحادي و العشرين من آذار كل عام.** واتە: **عێراقییەکان، بە شادی و خۆشییەوە، پێشوازی لە جەژنی نەورۆز دەکەن. ئاهەنگەکانی نەورۆز، لە عێراقی خۆشەویستماندا، هەموو ساڵێک لە بیست و یەکی ئاداردا دەست پێ دەکەن.** ئەو نەورۆزەی کە لە لایەن خودی ڕژێمی بەعسەوە کرا بە (جەژنی دار و درەخت).

ئەمانە تەنیا چەند نموونەیەک بوون لە تاکە کتێبێکی قوتابخانەکان کە مێشکی منداڵانی کوردیان پێ ئاو دەدرێ. بێگومان لە کتێبەکانی دیکەشدا زۆر نموونەی وا بەرچاو دەکەون. هیوادارم خەڵکی پسپۆڕ و مامۆستا و کەسانی لێهاتووی ئەم بوارە بە دەنگ بێن و سنوورێک بۆ ئەو وانە بێمانایانە دابنێن کە منداڵانی کوردیان پێ دەعارەبێندرێ.

## کوردستان و دەنگدانەوەی چوونی عەبدوڵلا ئۆجەلان بۆ ڕۆما

من لە هەولێر هەواڵی چوونی سەرۆکی پ.ک.ک عەبدوڵلا ئۆجەلانم بۆ ڕۆما بیست. بۆ جاری یەکەم لە دەنگوباسی ڕادیۆی BBC /بەشی عارەبی هەواڵەکەم بەر گوێ کەوت. دەنگوباسی چوونی ئۆجەلان بۆ ڕۆما لە ناو خەڵکدا دەنگی دایەوە. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی پارتی زۆر کەم خۆیان لە قەرەی هەواڵەکە دەدا، بگرە لە یەکێ لە دەنگوباسەکانیاندا تەنیا باسی چوونی (تیرۆریستێ مەزن) ئۆجەلانیان بۆ ڕۆما کرد. لە هەمان کاتیشدا هەر بیر و بۆچوون و قسەکانی تورکیایان دووپات دەکردەوە. زۆربەی هەرە زۆری ڕێکخراوەکانی دیکەی کوردستان، لە بەیاننامە و ڕاگەیاندنەکانیاندا، کەم تا زۆر پشتگیریی خۆیان بۆ عەبدوڵلا ئۆجەلان ڕاگەیاند.



وێنەی: عەبدوڵلا ئۆجەلان

داود باغستانی کە لە پارتی و مەسعوود بارزانیش نزیکە، لەوانەیە تاکە کەس بوویێ، کە هەر لە سەرەتادا دەستی بە مانگرتن لە نانخواردن کردبێ لە شاری هەولێر. باغستانی لە قسەکانی خۆیدا گوتی: عەبدوڵلا ئۆجەلان هەر لە حەفتاکانەوە دۆستی منە و، ئەو ئێستا لە ڕۆمایە، بەڵام دەستبەسەر نییە. دوێنێ شەو من بۆ ماوەی سێ دەقیقە قسەم لەگەڵ ئۆجەلان کرد. ئێمە هەموومان دەبێ پشتگیری لە ئۆجەلان بکەین. مەسەلەکە تەنیا بە پارتی کرێکارانی کوردستانەوە بەند نییە، بەڵکو هەموومان دەگرێتەوە. لە هەمان کاتیشدا پ.ک.ک دەبێ هێز و توانای تەواوی خۆی، بۆ گۆڕەپانی ڕاستەقینەی خەبات/باکووری کوردستان بگوێزێتەوە...هتد(١٦). پێش ئەوەی بگەڕێمەوە دەنگ هەبوو کە پارتی چاوی لە باغستانی سوور کردۆتەوە. ئەم قسەیەم لە خوێنکارێکی تازە دەرچووی کۆلێژی یاسا و سیاسەت/زانکۆی سەلاحەدین بەر گوێ کەوت.

ڕادیۆکانی دەنگی ئازادی/حیزبی شیوعی کوردستان - عێراق و نیشتمان/پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان و هەندێ ڕادیۆی دیکە هەواڵەکەیان بە بەردەوامی بڵاو دەکردەوە. ئەوان وەک پارتی و تورکمانەکان وشەی تیرۆریست و نازانم چی و چییان بەکار نەدەهێنا. تورکمانەکان دەیانگوت (ڕێکخراوەی پەکەکەی تیرۆریست). لە هەمان کاتدا هیچ لایەنێکی کوردی لە هەولێر، وەک پێویست، بۆیان نەدەچووە سەر بە تەواوەتی باسی ڕووداوەکە بکەن و، بە ئارەزووی دڵی خۆشیان شتەکان لێک بدەنەوە. یەک جار گوێم لە دەنگوباسی ڕادیۆی یەکێتی بوو، کەچی باسی هەواڵەکە هەر نەکرا. نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێ، جەلال تاڵەبانی لە تورکیا گوتبووی، نابێ بنکەکانی پ.ک.ک لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بمێنێت.

خەڵک بە شێوەیەکی گشتی لەسەر ئەوە ڕێک دەکەوتن کە ئیتالیا عەبدوڵلا ئۆجەلان تەسلیم بە تورکیا ناکاتەوە. هەندێکیش هەبوون دەیانگووت: (ئینشاڵلا شەت و پەتی دەکەن). لێ..بەڵێ زۆربەی خەڵکەکە سەریان لەو قارەمانی و نەبەردییانە سوڕمابوو کە بۆ کەسی ئۆجەلان ئەنجام دەدران. باسی ئەوە دەکرا لە هەندێ شوێنی کوردستان خۆپیشاندان و ناو کۆکردنەوە لە ئارادان بە مەبەستی پشتیوانی کردن لە ئۆجەلان.

لە باکووری کوردستان باس هەر باسی ئۆجەلان و پ.ک.ک و ئیتالیا بوو. لە میوانخانەی (بێش قارداشلەر/سلۆپی) خەڵک بە ئاشکرا باسی مەسەلەکەیان دەکرد. تورک هار بوویوون. تەلەفزیۆنەکانیان بووبوونە هاندەر و چاوساغیی گرووپە فاشیستەکان تاکو هێرش بۆ سەر بارەگاکانی پارتی (HADEP) ببەن، کە تاکە پارتی سەر بە کوردان و یاساییە لە تورکیادا. سەیتەرەکانی تورک، جەندرمە و پۆلیس، هەتا گەیشتینە دیلووک(غازی عەنتاب) لەوانەیە ٢٠ جاریشیان ڕاگرتبین. لە چێشتخانەیەکی ناو شاری (بیرەجک)ی کوردستاندا، یەکێ لە کرێکارەکان بە ئاشکرا باسی ئۆجەلانی بۆ ئێمە دەکرد و، دەشیگوت یەکێ لەو کوردانەی کە لە ئەورووپا خۆی سووتاندووە خەڵکی گوندێکی ئەو ناوچەیەیە. لە ناو شاری غازی عەنتاب وێنە و ئافیشەکانی سەرۆک وەزیرانی تورک مەسعوود یەڵماز(ئەو کات)، کە لە هەندێ شوێن هەڵواسرابوون، یان دڕێنرابوون یانیش بە بۆیەی سوور دەم و دانی خوێناوییان لێ زیاد کرابوو. لە میوانخانەکانی ئەو شارەش، بە تایبەتی لەسەر کەناڵی تەلەفزیۆنەکانی تورک، هەر هەموویان، باس باسی ئۆجەلان و پ.ک.ک و تورکیا بوو. تەنانەت لە ناو فڕۆکەخانەی غازی عەنتابیش، پاسەوانی بەر دەرگاکە کە خەڵکی خەرپووتی سەر بە پارێزگای ئەلعەزیزی کوردستان بوو، لەمەڕ عەبدوڵلا ئۆجەلان دەدوا. خەڵکانێکی دیکەش هەن کە گوێیان لە قسەکانی کاکی سەرباز بوو.

لە ناو فڕۆکەی نێوان غازی عەنتاب - ئەستەمبۆڵ - ستۆکهۆڵم لە کاتی خواردن دابەشکردندا، لەسەر سینییەکە، وێنەیەکی گچکەی ئەتاتورکیان بەسەر نەفەرەکاندا دەبەخشیەوە. لە وێنەکەدا ئەتاتورکی مامۆستا دەستی کچە قوتابییەکی گرتبوو. ئەمساڵ(١٩٩٨) تورکیا ٧٥ ساڵەی دامەزراندنی خۆی یاد دەکردەوە. (لەم بارەیەوە ڕۆژنامەنووسان دەڵێن: لە ماوەی دامەزراندنی ئەو کۆمارەوە تاکو ئێستا جگە لە چەند گۆڕانێکی ئاسایی کە بە هۆی ڕۆژگار ڕوو دەدات، ئەگینا لەم بەشەی سەر ڕووی زەمینەدا هیچ داهێنانێکی سەرسوڕهێنەر و ئەفراندنێک پێشکەش بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە نەکراوە)(١٧).

جێگای خۆیەتی لێرەدا وەک دوا قسە وتەی ژەنەراڵێکی فاشیستی تورک بخەینە بەرچاو کە لە زۆربەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی تورکدا باس کراوە. ژەنەراڵەکە دەڵێت: "پێویستمان بە کۆکردنەوەی سەد هەزار سەرباز بوو لەسەر سنووری سوریا تا بتوانین عەبدوڵلا ئۆجەلان لەو وڵاتە دەرکەین. ئێستا بە دوو سەد هەزار سەربازیش ناتوانین عەبدوڵلا ئۆجەلان بۆ سوریا بگەڕێنینەوە"(١٨).

## لە جیاتی کۆتایی

پڕ بە دڵ حەزم دەکرد تەنیا شتی جوان و باش لەسەر کوردستان و ڕێکخراوەکان بە گشتی و پارتی بە تایبەتی بنووسم، بەڵام چ بکەم ڕاستییەکان بەو شێوەیە نین. با هیچ لایەن و کەسێک بەزەییان بەخۆدا نەیەتەوە. لە سەردەمی حوکمڕانێتی یەکێتی لە هەولێر، هەروەها پارتییش، نووسراو و وتارم لەسەر هەردوو لایان نووسیوە و خوێندۆتەوە(١٩).

هەتا هوتێلی (شیرین پالاس)ی هەولێر وەک لانەی میت و موخابەرات و سیخوڕان بمێنێتەوە، دەبێ تاوانی پێنووسەکەی دەستی من چی بێ کە جار جار ناپاکان بداتە بەر نووکی تیژی خۆی؟!

سەرانی کورد و ڕێکخراوە کوردییەکان تەنیا و تەنیا بە دڵسۆزییان بۆ کورد، ئەگەر دڵسۆز بن، دەتوانن دەمی من و ئەم و ئەو داخەن. ئەگەریش نا، من خۆم باوەڕ ناکەم و لە تواناشمدا نییە و نابێ بێدەنگی هەڵبژێرم.

من، ئەگەر لەبەر بەرژەوەندی نەتەوەکەم نەبێ، هەرگیزاوهەرگیز نە دەست بۆ پێنووس دەبەم و نە خۆشم لە ناو ئازارەکانی گەل و نەتەوەکەمدا دەتوێنمەوە. هەر تاکێکی ئەم نەتەوە گەورە و گرانە ئەرکی سەر شانیەتی و دەشبێ وەک خزمەتکارێکی کوردیش ڕازی بێت.

لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم هەندێ ڕووی ڕەوشی ئەمڕۆی خوارووی کوردستانم هێنابێتە بەر باس، بە تایبەتی ئەو ناوچانەی کە لەبن دەستی پارتیدان و بینیومن.

*× سەردێڕی ئەم وتارە لە دەمی کچە کوردێکی هەولێرییەوە سەرچاوەی گرتووە. سەر قۆزی بن ئاڵۆز زیاتر بۆ شتێک، ڕەوشێک،...هتد، بەکار دەهێنرێت کە لە سەرەوە (ڕووکەش) ڕێکوپێک و جوان دیار بێ، بەڵام لە بنەوە یا لە ناوەوە (ناوەڕۆک) نادیار و ئاڵۆز بێ.*

**تێبینی و پەراوێزەکان:**

(١) قسەیەکی تاڵەبانی لە تەلەفزیۆنی MBC.

(٢) قسەی سەرۆ قادر لە دانیشتنێکدا لە هۆڵی (Akalla Träff)ی ستۆکهۆڵم لە ٥-٩-١٩٩٨.

(٣) بڕوانە لاپەڕەی دوایی لە کتێبی: بنەماڵانی بەناوبانگی ڕەواندز،

مەمدوح مزووری، هەولێر/کوردستان ١٩٩٨.
(٤) بەستی قەتەوی: شوێنێکی دەوروپشتی هەولێرە کە زبڵی لێ فڕێ دەدرێت.
(٥) تا ئێستاش کاسێتەکەم لا ماوە.
(٦) سەبارەت بە برینداربوون یا بریندارکردنی لێپرسراوی سوپای دووی دەشتی هەولێر جەمال مورتکە باس لە زۆر هۆ دەکرا. ناکۆکی ناو خێزان و هەوڵی خۆکوشتن و هێرشکردنە سەر و زۆری تریش. بە قسەی ئەوانەی کە سەردانیان کردووە، ئێستا ناوبراو دەست و قاچێکی مردووە. بە دەگمەنیش لە تەلەفزیۆن نیشان دەدرا. نێچیرڤان بارزانیش سەردانی ئەوی کرد.
(٧) زۆر ناو هەن دەکرێ بیاننووسم، بەڵام لەوانەیە خاوەنی ناوەکان خۆیان ئەم کارەیان بە دڵ نەبێ.
(٨)قسەیەکی ئەحمەد چەلەبیی سەرۆکی بە ناو کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق لە دانیشتنێکدا لە (Akalla Träff)ی ستۆکهۆلم لە سەرەتای مانگی جەنیوەری ١٩٩٨دا.
(٩) بڕوانە: خاک و چەوسانەوە، ڕۆمان، عەزیزی مەلای ڕەش، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری/هەولێر ـ کوردستان، ١٩٩٨، ل ٢.
(١٠) ئەمە قسەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕاگەیاندنەکانی پارتییە.

(١١) گولان العربي، العدد ٢٩ /تشرين الاول ١٩٩٨، اربيل/كردستان، ص ٢٧.
(١٢) نفس المصدر، ص ٢٨.
(١٣) نفس المصدر، ص ٤٥.
(١٤) بە مانای تۆڵەسەندنەوەی جەماوەر دێت.
(١٥) بۆ زیاتر ئاگاداری بڕوانە: كتاب اللغه العربيه للصف الخامس الابتدائي في المدارس المشموله بالدراسه الكرديه في اقليم كوردستان، اقليم كوردستان العراق/وزاره التربيه، مطبعه وزاره التربيه/اربيل ١٩٩٧م - ١٤١٨هـ.
(١٦) چاوپێکەوتنی ڕادیۆی نیشتمان/پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان لەگەڵ داود باغستانی.
(١٧) گولان، ژ ١٩٨، تشرینی یەکەمی ١٩٩٨، هەولێر/کوردستان، وتاری: تورکیا لە تێڕوانینی چاودێرەکان، ئامادەکردنی: ئامانج لەتیف، ل ٢٤.
(١٨) سوپاس بۆ ئەو برا کوردە باکوورییەی کە وتەکەی بۆ وەرگێڕامە سەر زمانی کوردی.
(١٩) هەر بۆ نموونە خوێندنەوەی بابەتێک لەژێر سەردێڕی (٢٣ ڕۆژ لە وێرانە ولاتێکدا) لەسەر ڕادیۆی (دەنگی کورد) لە بەرواری ٢٧-١-١٩٩٦ لە ستۆکهۆلم. هەروەها بڕوانە: گۆڤاری هەڵەبجە، ژ ٢٦، مای ١٩٩٦. ڕۆژنامەی هەتاو، ژ ١٥ و ١٦، ئۆگستی ١٩٩٧. ڕۆژنامەی هەتاو، ژ ٢٠ و ٢١، فێبریوەری و مارتی ١٩٩٨.

## نامەیەکی بێ وەڵام

گۆڤاری کۆنتراکت ئەم نامەیەی خوارەوەی بەرێ کرد، بەڵام وەڵامەکەیمان پێ نەگەیشتەوە. ئێمە لێرەدا دەقی پرسیارنامەکە بڵاو دەکەینەوەو دەمانەوێت سەرنجی خوێنەرانیش بۆ ئەوە رابکێشین کە ئەو وتارەی مەهاباد کوردی لە ژێر ناونیشانی: " **PKK و چەند سەرنجێک**"دا نوسیوویەتی پەیوەندی بە پرسیاری گۆڤاری کۆنتراکت و وەڵامنەدانەوەی (PKK)ەوە نییە و گۆڤاری کۆنتراکت بە هەلی زانی کە ئەو رایەش بخاتە بەردەمی خوێنەرانی.

**بەڕێزان کاربەدەستانی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) ڕۆژباش!**

لە ژمارەی (٢)ی گۆڤاری "کۆنتراکت" دا، ڕیپۆرتاژێکمان لەژێر ناونیشانی "ڕیپۆرتاژێکی چاوەڕواننەکراو"دا بڵاو کردەوە، کە **گۆران قەرەداخی** نوسیبووی. ڕیپۆرتاژەکە بریتی بوو لە چاوپێکەوتنێک و ڕاگەیاندنێک لە کەسوکاری ژمارەیەک منداڵی بە فڕێنراو لە قەڵەم دراوەوە.
ئێمە بۆ بەتەواوی ڕونکردنەوەی باسەکە لامان وایە کە پێویستە یەکەکەش وەکو لایەنێکی ئەم بابەتە مافی ئەوەی بدرێتێ کە قسەی خۆی بکات. کاتی بڵاوکردنەوەی ڕیپۆرتاژەکە، ماوە نەبوو پەیوەندیتان پێوە بکەین بۆ ئەوەی رای خۆتان دەببڕن، بۆیە ڕاگەیاندنێکمان لەگەڵ ڕیپۆرتاژەکەدا بڵاوکردەوە کە تیایدا نوسیبوومان بۆ ژمارەی داهاتوو پەیوەندی دەکەین بە (پ.ک.ک)ەوە، بۆئەوەی ئەوانیش قسەی خۆیان بکەن. وا لێرەدا ئەو دەرفەتە دەرەخسێنین بۆ ئەوەی رای خۆتان دەربارەی ئەو ڕیپۆرتاژەو کێشەکە دەرببڕن. هیوادارین لە ماوەی سێ حەفتەدا وەڵامتان بگاتەوە دەستمان. ئەگەر وەڵامیشتان نەدایەوە، ئەو کاتە وەڵامنەدانەوەتان بە خوێنەران ڕادەگەیەنین. تکایە لە وەڵامەکەتاندا، ئەم پرسیارانەی خوارەوە ڕوون بکەنەوە:

١-لە مێژە کێشەی منال و PKK لە ئارادایە، دەتوانن بە کورتی باسی ئەم پرۆژەیەتانمان بۆ بکەن؟
٢ـ ڕاگەیاندنی کەسوکارەکان ئەو منداڵانەیان بە ڕفێنراو لە قەڵەم داوە، ئەگەر وانییە بۆچی کەسوکاریان بە دوای منداڵەکانیاندا دەگەڕێن؟
٣-ئایا ڕاستە کە ئێوە ئەو مافەتان داوە بە خۆتان کە منداڵی خوار هەژدەساڵ بخەنە ژێر مەشقەوەو چەکیان بدەنە دەست؟ ئەگەر وەڵامەکەتان (بەڵێ)یە، تکایە وەڵامی پرسیاری (٤، ٥، ٦، ٧، ٨)یش بدەنەوە. ئەگەر وەڵامەکەتان (نەخێر)ە، تکایە تەنیا وەڵامی پرسیاری (٧، ٨) بدەنەوە.
٤ـئەمڕۆ لە کوردستانی باشووردا، لە ئەنجامی خراپەکاریی دەسەلاتەکانی ناوچەکەدا، چەندەها منداڵی ئەنفالکراوەکان و خەڵکی هەژار، لێی قەوماوە. چۆنە ئەو ڕێگایەتان هەڵ نەبژاردووە کە لە جێگای خۆیاندا خواردن و خەو و خوێندنیان بۆ مسۆگەر بکەن، بە بێ ئەوەی دەست بخەنە ئەرەوە چۆن بیر بکەنەوە؟
٥ـئایا ئەوانەی دوای ئۆردوگاکان دەچنە شەڕەوەو شەهید دەکرێن، کەسوکاریان ئاگادار دەکرێنەوە؟
٦-ئایا ئەو مەشقەی بەو لاو و منداڵانەی خوار هەژدەی دەکەن بەسە بۆ ئەوەی بتوانن بەرامبەر بە سوپای تورکیای پێ بوەستنەوە؟
٧-لە سویدیش کەسوکاری چەند منداڵێک هانایان بۆ حکومەتی سویدیی برد لەسەر ئەوەی منداڵەکانیان لە هاوینگەیەکەوە ئیتر بێ سەروشوێن دیار نەماوون. دواتر دەنگوباسی ئەوە بڵاو بۆوە کە PKK بردونی بۆ ئەڵمانیا. ئایا باشتر نییە قسە لەگەڵ دایکوباوکی ئەو منداڵانە بکەن و بەئاشکرا ئەو دەورانە بکەنەوە بۆئەوەی خەڵکی بە پێخۆشحاڵییەوە منداڵی خۆی بنێرێت؟
٨-ئایا ئەو کاردانەوانە، بۆ نموونە حکومەتی سویدیی و کەسوکاری منداڵان و لایەنی تر، هیچ کاری کردۆتە سەر ئەوەی کە بەم کێشەیەدا بچنەوە؟ ئەگەر ئا، دەتوانن بۆ خوێنەرانی کۆنتراکتی باس بکەن؟

**سوپاس بۆ هاوکاریتان**
**دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری کۆنتراکت**

# ئەرێ وەڵا كیمیاوییە

## ئەمە دوا بینین و دوا قسەی باوكم بوو لە ژیانیا كە هاتە گوێم

ئامادەكردن: كەماڵ جەماڵ موختار
١٩٩٩/١/٢٢ـ سلێمانی

## دارا ئومێد
## تەمەنی ١٣ ساڵ دەبێت
## كە بەر كیمیاویی
## داگیركەر دەكەوێت

"تەمەنم ئەو كاتە ١٢ساڵ بوو كە گوندەكەیان بۆردومان كردین و ئەنفالیان كرد". ئەم لاوە چوارشانە قژزەردە چەند جارێكی تریش ئەوەی وتەوە كە ئەو كاتە منداڵ بووە بۆیە نەیتوانیووە هیچ بكات. دەرگاكەی بۆ واڵا كردین و چوینە ژوورەوە، بەردەوامیش چاوە شینەكانی تێ بڕی بووم و چاوەڕێی دەكرد یەكسەر دەست بكەم بە پرسیار لێكردن:

**پ: جارێ پێشەكی خۆتمان پێ بناسێنە!**

ـناوم (دارا ئومێد عەبدولقادر)ە. ساڵی ١٩٧٦، لە گوندی گۆپتەپەی سەر بە ناحیەی ئاغجەلەر لە قەزای چەمچەماڵ، لە دایك بووم.

**و: كاتی بۆردومان و ئەنفالەكە لە كوێ بوویت؟**

ـ مانگی رەمەزان بوو، رێكەوتی رۆژی ١٩٨٨/٥/٣ كاتژمێر پێنج و چلوپێنج دەقیقە. هێشتا بیست دەقیقەی مابوو بۆ رۆژوشكاندن. كە باوكم بانگی كردم بۆئەوەی بچین لە لە ناو چەمەكەدا مانگاو ئاژەڵەكان بهێنینەوە، لە نزیك ماڵی خۆمانەوە یاریم دەكرد. بینیم كە فڕۆكەكان دوو جار بە نزمی بەسەر گۆپتەپەدا هاتن. ئەوەندە گوێمان نەدایە تا بۆ جاری سێیەم لە گەڕانەوەیاندا دەستی خۆیان وەشاند و گوندەكەیان بە كیمیاوی بۆردومان كرد. خەڵكەكە شڵەژان و كەوتنە راكردن، منیش بە دوایاندا. ئەوەندەم ئاگا لێ بوو كە باوكم هاواری كرد: "ئەرێ وەڵا كیمیاوییە". ئەمەش نەك دوا بینین بەڵكو دوا قسەی باوكم بوو كە بۆ دواجار لە ژیانیا هاتە گوێم. هەر كەسە خەمی ئەوەی بوو خۆی قوتار بكات و دوور بكەوێتەوە. منیش خۆم گەیاندە لای چەمەكە، خەڵكێكی زۆریش هەر وەك من بۆ ئەوێ رایان دەكرد.

گەیشتمە كوێ ئاوەكە، شڵپێك ئاوم كرد بە دەموچاوما و سەرم تەڕ كرد. چونكە وایان بۆ باس كردبووین كە لە كاتی وادا چاكترە دەموچاوت تەڕ بكەیت تا كیمیاوییەكە ئەوەندە كارت تێ نەكات. دوای ئەوە ئیتر ئاگام لە خۆم نەما و لە هۆش خۆم چووم.

بۆ رۆژی دوایی، نزیك مەلابانگان بە هۆش هاتمەوە، دیم لە شوێنەكەی خۆم نەماوم، تومەس كوڕێكی تر هەر بەناوی "دارا"وە منی گواستبووەوە بۆ جێگایەكی بەرزتر. لە خۆم ورد بوومەوە هەستم كرد دەست و قاچم بەباشی ناجوڵێتەوە و لەكار كەوتوون. چاویشم كەم حوكم بووە. بە هەر حاڵێك بوو بەلای كوێ چەمەكەدا شۆڕ بوومەوە و دەست و دەموچاوم شۆریی. بەردەوامیش گوێم لە دەنگی تۆپباران و تەقە بوو كە لە دوورەوە دەنگیان دەهات. دوو ژن هاتن و هەواڵی مێردەكانیان لە ئێمە پرسی. ئێمەش لە وەڵامدا وتمان كە ئاگامان لە هیچ نییە و نەمان دیوون. لەم قسانەدا بووین كاتێك زانیمان دوو جاش پەیدا بوون. كەوتنە قسەو بە منیان وت: "ئێمە پێشمەرگەی مام رۆستەمین، مەترسە! دایك و بابت وان لە ناو گوندەكەدا، وەرە لەگەڵمان!" من بڕوام پێ نەكردن و وتم نایەم. بەڵام ئیتر بە هەر شێوەیەك بوو من و ئەوانەی دەوروبەریان لەگەڵ خۆیاندا بردەوە ناو گوندەكە. زۆرمان برسی بوو، سەرو پارچە نانیان بۆ هێنایین. دوای نانخواردنەكە هەموومانیان سواری ئۆتۆمۆبیل كرد، لەگەڵیاندا كەوتینە رێ. هێندەی نەبرد پاش ماوەیەكی كورت لوتمان بوو بە لوتی سەربازەكانەوە و دایان بەزانین و تەسلیم بەوان كراین.

**پ: ئەو كاتەی كە گەڕاینەو بۆ ناو دێ چیت بینی؟**



ستۆدیۆ هونەر: وێنەی ئایشێ حاجی محەمەد لە گۆڕستانی شەهیدانی گۆپتەپە



ستۆدیۆ هونەر: وێنەیەک لەسەر هەندێک گۆڕی گۆڕستانی شەهیدانی گۆپتەپە

و: وەکو وتم من چاوم پەرێشان بوو، بە تەواویی هەموو شتێکم نە دەبینی و لە ترسانیشا نەم ئەوێرا تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆم بکەم. لە هیچ شتێک دڵنیا نەبووم. ئەوانەی مابوون هەر یەکە بە لایەکدا رایان کردبوو. کەسی وای تیادا نەمابووەوە، هێشتا سەربازەکانیش نەهاتبوونە ناو گوندەکەوە، هەر جاشی تلێ بوو. ئەوانیش کە لە نزیک چەمەکەدا بوون زۆربەیان گیانیان لە دەست دابوو، هەر ئەوەندەم دەبینی خەڵکێکی زۆر لەم لاو لەو لای چەمەکەوە کەوتبوون. دوای ئەوەی کە وتم کەوتینە بەر دەست سەربازەکان، ئەوانیش ئێمەیان برد بۆ سەربازگەکە کە لەسەر رێگای تەکیە بوو. چەند جاشێک چاویان پێمان کەوت و بەزەییان پیماندا هاتەوەو چوونە لای سەربازەکان. دیار بوو یەکتریان دەناسی، بە پارانەوەو لاڵانەوەو مشتومڕێکی زۆر توانیان رازیان بکەن کە ئێمە ئازاد بکەن و تەسلیم بە جاشەکان کراین. ئیتر جاشەکان هاتنە لامانەوەو کەوتنە پرسیار کردن وەک ئێوە کوڕی کێن و خزم و کەسوکارتان لە کوێن. لە وەڵامدا من وتم لە تەکیە خزمم هەیە و ماڵی فلان کەسە. ئیتر منیان بۆ ئەوێ بردو تەسلیمی خزمەکانم کرام. پاش ماوەی چەند رۆژێکی تریش لە "تەکێ" وە رەوانەی خزمەکانی سلێمانی کرام. ماوەیەک لە سلێمانی مامەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک نەم دەتوانی لەبەر ئەوەی چاوم باش نەی دەبینی بە هیچ لایەکدا برۆم، یان لەترسانا بچمە دەرێ. دوای ئەوەش بۆ ماوەیەک چوومە سەقزی کوردستانی ئێران و ماوەی نیوو ساڵێکیش لەوێ مامەوە. پێش راپەرینەکەش جارێکی تر بۆ سلێمانی گەڕامەوە.

**پ : چەند کەس لە کەسوکارەکەت تیا چوون؟**

و: ئێمە سێ ماڵ بووین بەیەکەوە دەژیاین، ماڵی دوو مام و خۆمان و هەروەها باپیریشم لەگەڵماندا بوو. ئەوان زۆربەیان تیان چوون و لە خێزانەکەی خۆشم سێ براو خوشکێک و دایکم تیا چوون، بابیشم ئەنفال کراو سەروشوێنی نەما.

**پ: ناوکانیان دەتوانیت بڵێی؟**

و: بەڵێ، باوکم ناوی ئومید عەبدولقادر عەبدولڵایە، دایکم عەتێ عەبدولرەحمان، خوشک و براکانم: دانا(١٩٧٨) دەریا (١٩٨٤)، پڕۆڵا (١٩٨١)، سارا (١٩٨٠).

گۆپتەپە، کە ئەو کاتە نزیکەی ٥٠٠ ماڵێکی تیا بوو، لە هەموو گوندەکانی دەوروبەری ئاوەدانتر بوو. پاش راپەرینەکە، ئەوانەی خۆیان قوتار کرد بوو، ئێستا زۆربەیان گەراونەتەوەو گوندەکەیان ئاوەدان کردۆتەوە.

**پ: ئەی تۆ؟**

و: گۆپتەپە نزیکەی ٥٠٠ ماڵ دەبوو، ژمارەی ١٥٠ کەسی بە کیمیاباران لێ شەهید کراوە و ٥٠٠کەسیشی لێ ئەنفال کراوە. ژمارەی هەژدەکەس لە ماڵی ئێمە بەر کیمیاباران کەوتن و١٠کەسیشمان ئەنفال کرا. من ئێستا هەر خۆمم. تەمەنم ٢٢ ساڵە و قوتابی پۆلی شەشەمی زانستییم لە ئامادەیی رۆشنبیر. لە دوای ئەنفالەکەوە لە ماڵی پارێزەر (مستەفا عەسکەریی)م کە خزممانە و خۆم بە کوڕی ئەو دەزانم. هەر لە ماڵی ئەوانیش بەردەوامم لە خوێندندا.

# P.K.K و چەند سەرنجێک

مەهاباد کوردی

پروپاگەندەی دژی P.K.K:

**- لەناو گریلاکاندا کوڕ و کچ بەیەکەوە دەخەون، کافرسانییەکە هەر مەپرسە!**

**- گریلای P.K.K دڕندە و کێوی و مرۆڤخۆرن**

مرۆڤ کە باسی خوارووی کوردستان بکات، نابێ خۆی لە هەندێ شتانیش لابدات کە پەیوەندییان بە پارتی کرێکارانی کوردستانەوە هەیە. لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی پارتیدا بە هەموو شێوەیەک هەوڵ دەدرێت ناوی پ.ک.ک بزڕێنرێت و لەکەدار بکرێت. پارتی دیموکراتی کوردستان لەم هەنگاوەیدا تا چ رادەیەک سەرکەوتووە، ئەمەیان شتێکی دیکەیە. بە هەر حاڵ کردەوەکانی پارتی کاریگەریان هەبووە و هەیە لەسەر هەندێ لایەنی خەڵک و شێوەی بیرکردنەوەشیان. هەر وەک نموونە ( بۆ ل:٤٢)

# ڕێکخراوی ئەنفال و ئاوارەکانی کوردستان



**عەلی مەحمود**

**بە کۆمەڵێک تاقیکردنەوەو پرسیارەوە**

## •ئیسلامییەکان لە وشەی "ئەنفال" سڵ دەکەنەوەو داوای گۆرینی دەکەن، توندڕەوە چەپەکانیش بە ناسیۆنالیزمی دەدەنە قەڵەم

**•بۆ بارزانییەکان لە ڕۆژی (٨٣/٧/٣١)دا ئەنفال کران؟ بۆچی هەڵەبجە لە (٣/١٦)دا بەر کیمیاوی درا؟ کێ بوون لە ئەنفالەکاندا ڕێگربوون لەبەردەمی خۆڕزگارکردنی خەڵکییدا؟ تاکەی تاوانکارە کوردەکانی ئەنفال باڵادەست دەبن؟**

**پ: ڕێکخراوی ئاوارەو ئەنفالەکانی کوردستان کەی و لە کوێ دامەزرا؟**

و: ڕێکخراوی ئاوارەو ئەنفالەکانی کوردستان لە (١٩٩٤/٩/١)دا، لە ناوەندی ڕۆشنبیریی سەردەم، لە هەولێر دامەزرا.

**پ: ئەم ڕێکخراوە تا ئێستا چۆن هاتووە؟ چەند ئەندامی هەن و لە کوێ هەن؟**

و: بەڵگەنامەکانی سەر رووبەری ڕۆژنامەکانی ناوخۆی کوردستان ئەوە دەردەخەن کە ئەم ڕێکخراوە چالاکترین ڕێکخراوی جەماوەریی بووە لە کوردستاندا، لە پاڵ چەند ڕێکخراوێکی زۆر کەمی دیکەدا، کە بە پەنجەکانی یەک دەست دەژمێردرێن. کلکی هیچ حیزبێکی سیاسی نەبوو.

سنووری چالاکییەکانی بەشێوەیەکی گشتی پارێزگای هەولێر بووە، بە زۆربەی ناحیەو ئۆردوگاو شارۆچکەکانی دەوروبەرییەوە.

ژمارەی ٣٠ کەس ئەم ڕێکخراوەیان دامەزارند و دەیان کەسی دیکە لە چالاکییەکانیدا بەشدار بوون. بنەمای ڕێکخستنی لەسەر کۆبونەوەی گشتی ئەندامگیریی خێزانی ئاوارەو کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بووە. بۆیە ئەندامەتی لەم ڕێکخراوەدا لەسەر بنچینەی پەسەند کردنی بەرنامەو ئابوونەدان نەبووەو بێسنوور بووە. ناسنامەی ئەندامەتی بۆ هەزاران کەس کردووە. سەرجەم ئەو کەسانەی سەر بەو توێژانە بوون، ناونووس کرابێتن یان نا، مافی بەشداری کۆبوونەوەی گشتیی و دەنگدان و خۆپاڵاوتنیان هەبووە. نوێنەرو سەرجەم پلەکانی لە ڕێگەی کۆبوونەوەی گشتییەوە هەڵبژێردراون.

**پ: ئەوەندەی تۆ ئاگات لێ بێت چەند ڕێکخراوی تری لەم جۆرە هەن کە تایبەت بن بە ئەنفالەکان؟ یان بە مەسەلەی ئەنفالەوە؟**

و: ئەوەی من ئاگام لێ بێت تەنها کۆمەڵەی مناڵە ئەنفالکراوەکانی کوردستان بوو. ئەم ڕێکخراوەش بەهۆی تەنگوچەڵەمەی ئابووری و سیاسییەوە تەنها بڕبڕەی پشتی بە شکاویی مابوو. ئەمانیش لە ڕێگەی سەربازی نەناسراو (**نیهاد دزیی**)ەوە بەشدارییان لە زۆربەی چالاکییەکانی ئێمەدا دەکرد. هەروەها (ی.ن.ک) جگە لە کۆمیتەی ئەنفالەکانی، دوو ڕێکخراوی دیکەی بەناوی "کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوک" و "گەرمەسێر" دروست کرد بوو، کە ئەمانەش ڕاستەوخۆ شان بەشانی مەڵبەندەکانی (ی.ن.ک) کاریان دەکرد. بەڵام تەماشای ئەم نموونەیەی خوارەوە بکە:

١- بە بۆنەی فێستیڤاڵی دووی ئەنفالەکانەوە ساڵی ١٩٩٦، بڕیار وابوو لە ژێر ناوی (کوردقڕان)دا، پێشانگایەکی هاوبەش بۆ ١٨ هونەرمەندی ناوداری گەلەکەمان بکرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە گالەریی میدیا گیرا، بەڵام ڕۆژی کردنەوەی پێشانگاکە، کە بڕیار وابوو کیژۆڵەیەکی ١٠ ساڵەی کەسوکار ئەنفالکراو بیکاتەوە، فلیم گۆڕدرا بۆ تێکۆشانی "صەولەی بەدر" (باڵی سەربازیی "مجلس الاعلی")، کە هێشتا لە دیمشق مەرەکەبی قەڵەمەکانیان لە دژایەتی کورددا وشک نەبوو بووەوە. کاک جەبار فەرمان پێشانگای بۆ کردنەوەو پاشان بە گەلەکۆمەکێی سێ پارێزگار و خۆی و دوو سەرکردایەتی، بەیەکجاری فێستیڤاڵەکەیان داخست، کە لە (٧)ی نیساندا ساز کرا و بڕیا وا بوو ٨ڕۆژ درێژە بکێشێت و لە ڕۆژی (٤/١٤)دا بە کەرنەڤاڵێکی شانۆیی فرە مەزن کۆتایی پێ بێت. لەبری هاوکاریی، لەسەرەتادا گالەریی میدیایان لێمان زەوت کردو دایان بە صەولەی بەدری "مجلس اعلی". دوای ئەوە لە (٤/٩)دا هۆڵەکەیان لێمان سەندەوەو هەڕەشەیان لە **عوزێر وەهاب** کرد کە لە کۆڕی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤدا بەشداریی نەکات. بۆ ئەم مەبەستەش بەڕێزان جەبار فەرمان و محەمەد شاکەلی و سێ پارێزگاکەی هەولێر، سلێمانی و کەرکوک لەگەڵ حاکم قادر (ساڵی پێشتر هاوکاریی ماددی و مەعنەوی کردبووین) و سەرۆکی پۆلیس و محەمەد موکری و عوسمان فەرەج، کۆبوونەوەیەکیان کرد. پێشتر

ویستیان دانەخۆرەی هونەرمەندان و نووسەران بکەن، بەڵام لە هەولێر تەنها کەسێک وەڵامی نەدانەوە. بۆیە تەنها بە تێکدان دەیان توانی رای بگرن. دواتر خۆیان فێستیڤاڵێکیان ئەنجام دا، کە لە رووی ناوەڕوک و هونەرییەوە گەلێک لەوەی ئێمە بچووکتر، بەڵام لە رووی خەرجییەوە دەیان جار لە ئێمە زیاتریان خەرجیی هەبوو.

**پ: مەبەست و ئامانجی دامەزراندنی ئەم رێکخراوە چی بوو؟**
و: مەبەست لە دامەزراندنی ئەم رێکخراوە ئەوە بوو وەکو دەستەیەکی بچوکی باڵەپەستۆکەر بتوانێت ببێتە دەنگێک بۆ ناساندنی کێشەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان و ئاوارەکان و هەوڵی باشکردنی باری ژیانیان بدات. بەرەوڕووی تەعریبی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەعس رابووەستێت. نەترسانە هەوڵی دەرخستنی تاوانکارانی ئەنفال بداو دیوی ناوەوەی ئەنفالەکان بۆ جەماوەر دەربخات.

**پ: ئایا تا ئێستا چیتان کردووەو دەتانەوێت چی بکەن؟**
و: جگە لە هەڵوێست وەرگرتن، بەرامبەر بەو شتانەی کە پەیوەندییان هەبووە بە جینوسایدکردنی کوردو رووداوی سیاسی ترەوە لە کوردستان، بەدەرکردنی بەیاننامەو بەشداریی لە زۆر یادو رووداودا، ئەم رێکخراوە بچووکە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا توانیویەتی:
١- بۆیەکەم جار فێستیڤاڵ بەبۆنەی ئەنفالەوە، لە کوردستانی چوار ساڵ ئازادکراودا، رێک بخات و ئەنفالی لەیادکردوو بێنێتەوە یادی کۆمەڵ و حیزبەکان. رۆژی ٤/١٤ بکات بە رۆژی ئەنفال. ساڵی ١٩٩٦، لەم رۆژەدا نزیکەی ٤٠ بەیاننامە، بە داخوازیی رێکخراوی ئاوارەو ئەنفالەکانی کوردستان، لە لایەن حیزب و رێکخراوە سیاسی و جەماوەرییەکانەوە دەربکرێت.
٢- کێشەی قانونیی خێزانی ئەنفالکراوەکان بجوڵێنێ و کۆڕی رێکخراوەکانی ژنان بۆ ئەم مەبەستە ساز بدات. بۆ ئەوەی بۆ نموونە، ژنانی پاشماوەی ئەنفالەکان لە چاوەڕانییدا ژیان نەبەنە سەر و مافی شووکردنەوەیان بدرێتێ.
٣- هەوڵی بەرپرسیارکردنی دەسەڵاتدارانی ئەنفالی چەشنی **وەفیق سامەرائی داوە.** بە بیرخەرەوەو کۆکردنەوەی ئیمزای بەرفراوان داوای ئاشکراکردنی چارەنووسی ئەنفالکراوەکانی لێ کردوون، بەڵام هەوڵەکان بێ وەڵام بوون.
٤- کوردە بەشدارەکانی ئەنفالی بە جەماوەر ناساندووەو داوای دەرکردنیانی لە ریزی حیزبەکاندا کردووە.
٥- داوای باشکردنی باری ژیانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکانی کردووە. بۆ ئەم مەبەستە چەندین بیرخەرەوەو یاداشتنامەی لەسەر دانی ئیمتیازاتی شەهیدان بە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان، داوە بە هەردوو حکومەت.
٦- کاری بەناو خزمەتگوزاری هیلالە سوورەکانی (تورکیا و ئێران)ی لە کوردستاندا رسوا کردوەو نەخشە نهێنیەکانیانی ئاشکرا کردووە.
٧- دژی تیرۆری پەنابەران بووە لە کوردستان. ئەنجامدەران و هاوکاریکەرانی رسوا کردووەو کاری جەماوەریی، لە بابەتی خۆپیشاندان، کۆڕوکۆبونەوەو کۆکردنەوەی ئیمزای، کردووە.
٨- پەیوەندی لە گەڵ ئاوارەکانی باشوور و رۆژهەڵات کردووە. لە کاتی هێرشەکاندا چالاکیی جەماوەریی نواندووە.
٩- سەرپەرشتی زۆر لە نارەزاییەکانی ئاوارەکانی کردووە.
ئەم چالاکییانە تا رۆژی (٩٦/٨/٣١)یە. لەوە بە دواوە ئەم رێکخراوەیەش وەک حیزب و رێکخراوی جەماوەریی دیکە کارەکانی تەنها لە بەیاننامەدا قەتیس ماوەو لەبەر بێ دەرامەتی و کەمبوونەوەی ئازادیی سیاسیی (بۆ نموونە، رێگا بە فێستیڤاڵی سێ نەدرا) بەرەو هەڵوەشانەوە دەڕوات.

**پ: تۆ کە لەم بوارەدا تاقیکردنەوەت هەیە، پشتگیریی و بەدەنگهاتنەوەی خەڵکت چۆن دێتە بەرچاو؟**
و: هەموو کاتێک گەلە قڕکراوەکان یادکردنەوەی رۆژە رەشەکانیان بە ژیانی داهاتووی خۆیان زانیووە. سەیرکەن پاپا لەم ساڵانەدا کە چووە وڵاتی پیرو، رێکخراوێک کە داکۆکی لە پاشماوەی هندییە سوورەکان دەکات، نامەیەکی ئاڕاستەی میوانە خۆشەویستەکەیان کرد. پوختی نامەکە دەڵێت: "بەڕێز یۆحەننا پۆلسی دووەم! هاتنت بە هەل دەزانین تا ئەم ئنجیلەت بۆ بگەڕێنینەوە. چونکە پەیامەکانی بۆ ئێمە تەنها قڕکردن بوو. ئەم ئنجیلە ببەخشە بە چەوسێنەرەکانمان، ئەوان پێویستیان بە پەیامەکانی هەیە". خەڵکی بە پەرۆشەوەن بۆ یادکردنەوەی کارەساتەکانی وەکو: ٤/١٤ و هەڵەبجەو ئەنفال.

**پ: کام حیزب لەو حیزبانەی کوردستان، یارمەتی و پشتگیریی ئێوە یان رێکخراوێکی تری ئەنفالیان کردووە؟**
و: کۆمەکەکان تەنها بۆ ئەوەندە باشە بۆ نوکتە باس بکرێت، بەڵام کە دێتە سەر پشتگیری مەعنەوی راگەیاندن ئەوا (حشک، پارتی کار، یەکێتی نەتەوەیی، تێکۆشان، یەکگرتنی ئیسلامی، بزووتنەوەی میللی، زەحمەتکێشان، بزووتنەوەی جوتیاران) کەم و زۆر هاوکاریی ئێمەیان کردووە. سەیر کەن! دوو ساڵ خەریکی خورشید هورمزیار (حیزبی سۆسیالیست) بووین نەمان توانی پارەی یەک پاکەتی جگەرە کۆمەکی لێ وەربگرین.

**پ: رۆژی (١٤)ی نیسانتان ناویردووە بە رۆژی ئەنفال، بۆ ١٤**

**وێنەی دیداری ئەنفالکراوەکان.**
**چەند کەلوپەلێکی بەسەریەکاشکاوی جێماو.**

**نیسان؟ ویستووتانە لەم رۆژەدا چی بکەن؟ بۆ لاتان گرنگە کە یادی ئەنفال بکرێتەوە؟**

و: ئەنفال لە ساڵی (١٩٩٨)دا کرا حەوت مانگ درێژەی کێشا. ئەم کارەساتە گەورەترین کارەساتی جینوساید بوو دەرهەق بە گەلی کوردستان ئەنجام درا. بۆ ئەوەی لە یاد نەکرێت، بۆئەوەی لە مێژووی گەلەکەمان دیاری بکرێت و هۆکارەکانی دەست نیشان بکرێت، بۆ ئەوەی درندەیی داگیرکەرانی کوردستان دیاری کەین و بەبیروڕای دەرەوەی ئاشنا بکەین پێویستە یادی کەینەوە. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە رۆژێک دیاری بکەین. لەبەرئەوەی لە رۆژی (٤/١٤)دا تاوانەکە لە ناوچەی کەرکوک گەیشتە ترۆپکی و بەتەنها لەو رۆژەدا ١٨ هەزار کەس گیران، بۆیە ئەو رۆژەمان دیاری کرد بە رۆژی ئەنفال.

بۆ ئەم کارەساتە لەم رۆژەدا فێستیڤاڵمان ئەنجام داوە، تا لە رێگای ئەم فێستیڤاڵەوە ئەو کێشانەی پەیوەندی بە ئەنفالەوە هەیە هەقی خۆیان بدرێتێ، لە باری ژیانی ژنان و کەسوکاری ئەنفالکراوەکانەوە تا کێشەی تاوانکاران و بە مێژووکردنی رووداوەکە و ناساندنی دیوی ناوەوەی کارەساتەکە بە کۆمەڵ.

**پ: حیزبەکان گەورەو بچوکیان تا چ رادەیەک دەربارەی ئەنفال لە پشت یادکردنەوەکان و ئاگادارکردنەوەی خەڵکی کوردەوە بوون؟**

و: وەکو باسم کرد چوار ساڵ بوو کوردستان بەعسی تێدا نەبوو، هەموو حیزبەکان ئاهەنگەکانی خۆیان بەڕێوە دەبرد. بەڵام هیچ کامیان بە بیریانا نەهات دەسپێشکەری بکەن و یادی ئەنفال بکەنەوە. کە یادیش کرایەوە، ئیتر بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ یادێکی وادان. بەڵام ئەوانەی خانەخوێی تاوانکارانی ئەنفالن و لە فەتح و فتوحاتەکانی دوێنێدا نەخشیان هەبوو، لەگەڵ ئەوەدان تەنها خۆیان یادی بکەنەوە، نەوەکو دەست بۆ نهێنییە بۆگەنەکانی ببرێت. دەیانەوێت یادەکان لە شێوەی ئاهەنگێکی مۆسیقی رووکەش تێپەڕ نەکات. هەروەها، ئیسلامییەکان لە وشەی "ئەنفال" سڵ دەکەنەوەو داوای گۆڕینی دەکەن و توندڕەوە چەپەکانیش بە ناسیۆنالیزمی دەدەنە قەڵەم. ئەوە لەو دەستەو پارتانەی چەشنی پارێزگارانیش گەڕێ کە بۆخۆیان دوێنێ جاشی بەعس بوون.

حیزبەکانی دیکەش، کە لە کوردستانی دیموکراسیدا تەنها بارەگاکانیان ئازادە، هەنگاوی شیاویان لەم بارەیەوە نەناوە. یادکردنەوە کاتێک لای ئەوان شیاوە کە سەرجەم سکرتێرە گشتییەکان یەک بە دوای یەکدا لەگەڵ یەکێک لە دوو سەرکردەکەدا بێنە سەر مایکرۆفۆن و جێگەیەک بۆ بێکاریی خۆیان بدۆزنەوە.

**پ: بە رای تۆ تا چ رادەیەک خەڵکی کورد لە دیوی ناوەوەی ئەنفال دەزانێت؟**

و: لای خەڵکی کورد بەتایبەتی چینە هەژارەکان، ئەوانەی زۆرترین زیانیدەی گۆڕانکارییەکانن، کۆمەڵێک پرسیار دروست بووە وەک: قازانجی بزووتنەوەی نیشتیمانی کوردستان لە لێدانی نەوتی کەرکوک، رۆژی ١٩٨٦/٩/١١ لە لایەن (ی.ن.ک) و ئێرانەوە، چی بوو؟ بۆ بارزانییەکان لە رۆژی (٨٣/٧/٣١)دا ئەنفال کران؟ بۆچی هەڵەبجە لە (٣/١٦)دا بەر کیمیاوی درا؟ کێ بوو ئەوەی ملوانکەی ملی کیژانی هەڵەبجەی دزی؟ کێ بوون لە ئەنفالەکاندا رێگربوون لەبەردەمی خۆڕزگارکردنی خەڵکیدا؟ کام حیزب بووە رەزمەندگانی ئیسلام؟ تاکەی تاوانکارە کوردەکانی ئەنفال باڵادەست دەبن؟ وەفیق سامەرائی و هاوچەشنەکانی بۆچی بە شێوەیەکی ورد باسی تاوانەکانی سەددام و هاورێکانی، دژ بە خەڵکی کوردستان ناکەن؟ ئەم پرسیارانە هێشتا خەڵکی کورد وەڵامێکی پڕ بە پێستی بۆ دروست نەکردون. رێکەوتن لەسەر ئەو پرسیارانە واتە گۆڕانکاریی لە هەناوی جولانەوەی رزگاریی کوردستاندا. کەواتە ئەگەر بمانەوێت باسی گۆڕانکاریی لە هەناوی جولانەوەکەدا بکەین، لەسەرەتادا دەبێت لەگەڵ گەلدا بە وەڵامی ئەم پرسیارانە دەست پێ بکەین. گرنگی ئەنفال و هەڵەبجەو بارزانییەکان لێرەدایە.

**پ: بە رای تۆ دەبێت چی بکرێت بۆ ئەنفال؟**

و: بۆئەوەی هەر کارێک بکرێت دەبێت لە پێش هەموو شتێکدا رێکخراوێک دروست بکرێت، دەبێت لە ناوەوەو دەرەوە دەنگی ئەو کەس و گروپانە یەک بخات و کارەکانیان هاوئاهەنگ بکات. ئێمە لە لایەکەوە دەمانەوێت نهێنییەکانی کردارە تراژیدیەکان بە گەلەکەمان ئاشنا بکەین و بە رێگەیەکی شیاو هاوکاری قوربانیەکانیان بکەین. لە هەمان کاتدا دەمانەوێت خۆمان وەک گەلێکی قڕکراو بەدەرەوە بناسێنین. کەواتە کارەکانمان لەناوخۆو دەرەوە دەبێت هاوئاهەنگ بکرێت. هیچ کۆمەڵەیەک ئەگەر تەعبیر لە گروپێک نەکات لە ناوەوە کارەکانی سەرکەوتوو نابێت، لە هەمان کاتیشدا بۆ ناوەوەش راستە. بۆ ئەم یەکێتییەش خاڵی دەست پێکردن پێویستە ئەویش سەرجەم دەستەو گروپەکانی ناوەوەو دەرەوە یەکگرن. وە بە هۆی ئەو بارە ئابوورییەی لە کوردستاندا هەیەو ئابلوقەی حزبە دەسەڵاتدارەکان لەسەر رێکخراوە مەدەنییەکان، بە بوونی ئەو هاوئاهەنگییە بە دابین کردنی ئابوونەیەکی کەم بۆ کارە رۆشنبیرییەکان دەکرێت رێکخراوێکی چالاک دروست بکرێت و ئەو کارانەی پێویستە بۆ ئەنفال بکرێت بەکاری خۆی بزانێ و جێبەجێیان بکات. ئەو کارانەش بە بڕوای من:

- پێکهێنانی کۆمیتەیەک بۆ کۆکردنەوەی هەموو ئەو نووسین و چالاکیانەی لە سەر ئەنفال نووسراون و کراون و لێکۆڵینەوەیەکی هەمە لایەنەی ئەو کارەساتانە بکات و بڵاوی بکاتەوە.
- ناوی ئەنفالچی و تاوانبارە کوردەکان دیاری بکات، باڵەبەستۆ بخاتە سەریان تا لە بەردەم ناوەندە جیهانییەکاندا دان بە تاوانەکانیاندا بنێن.
- باڵەبەستۆ بخرێتە سەر کەسانی چەشنی وەفیق سامەرائی تا نهێنی لەسەر چارەنووسی کەس و کارەکانمان ئاشکرا بکەن.
- زانیاری لەسەر ژمارەی ئەنفالکراوەکان، بکەرەکانیان و ژمارەی پاشماوەکانیان کۆ بکرێتەوە وێنەیان و شکایەتنامەی کەس و کارەکانیان لەسەر بزربوونی کەس و کارەکانیان روو لە دادگاکانی کوردستان و ئەورووپاو جیهان و ناوەندەکانی مافی مرۆڤ ئامادە بکرێت.
- هەوڵ بدرێت لە ئاستی جیهانیدا وەکو ئەوەی بۆ قڕکردنی ئەرمەنەکان کرا (لە پەرلەمانی فەرەنسا رۆژێک دیاری کرا بە رۆژی قڕکردنی ئەرمەنەکان، تورکیا نارەزایی دەربڕی)، لە رێگەی پەرلەمانەکان و ناوەندەکانی وەک فاتیکانەوە ٤/١٤ دیاری بکرێت بە رۆژی ئەنفال.

**رۆژی ئەنفال کەی بێت راستە؟**

گرنگە ئەوەی دەبێت بە نەریت لەسەر بنکەیەکی خۆگر دابڕێژرێت.

رای خۆت بنێرە!

# ئۆردوگای ئەڵتاش لە رومادی

ئامادەکردن: کاوە ئەمین
١١/١٩٩٨، سوید

---

## ساڵح پالانی:

**•وەکو قەفەس وابوو، بەڵام خزم و کەسوکار و عەشرەتی یەکتر بووین**
**•پاش نزیکەی ساڵونیوێک خەڵکەکە بە قوڕ خانوویان دروست کرد**
**•دوای شەڕی عێراق و ئەمەریکا زۆر ژن لە منداڵبووندا گیانیان لە دەست دا**
**•رادەی مردنی منداڵ لە ئۆردوگاکە زۆر بوو**
**•ساڵانی ٨١ و ٨٢ ئۆردوگاکە دەگەشتە ٤٠ هەزار کەس**
**•قوتابخانەکان خۆمان دروستمان کردبوون و مامۆستاکانیش لە خۆمان بوون**
**•کچە قوتابی لە ئۆردوگاکەدا زۆر بوو**
**•ژیانی سەختی ئۆردوگاکە هەموو شتێکی لە بیر خەڵکەکە بردبووەوە**
**•زیاد لە هەزار کەس بە دەستی عەرەبەکان کوژران**
**•ئەو رۆژەی ئۆردوگاکەمان بەجێ هێشت، یەکجار هەستمان بە غەریبیی کرد**

ئۆردوگای ئەڵتاش (رومادی)، ئۆردوگایەکە کە حکومەتی عێراق دروستی کردوەو بۆ کوردی رۆژهەڵات. ماوەیەکی زۆر بوو لێرە و لەوێ باسی ئەم ئۆردوگایە دەکرا، هەرکەسە و بەجۆرێک باسی ژیانی کوردەکانی ئەم ئۆردوگایەیان دەکرد. ماوەیەک لەمەوپێش بەرێکەوت چاوم بەدوو لاوی کورد کەوت کە ماوەی ساڵێکە لەو ئۆردوگایەوە هاتونەتە وولاتی سوید. بۆ ئەوەی کەمێک زانیاری لەسەر ئەو ئۆردوگایە وەربگرم، داوام لێکردن کە چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ بکەم. بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە ئەوان لەشارێکی تر دەژیان، لەسەر ئەوە رێکەوتین کە پرسیارەکانیان بۆ بنێرم و ئەوانیش بە نامە وەڵامم بدەنەوە. ئەوەی کەئێستا دەیخوێننەوە سەرەنجامی ئەو وەڵام و پرسیارانەیە، کە هیوادارم کوردەکانی دەرەوەی وڵات لەژیانی چەندین هەزار کوردی ئاوارەی نیشتەجێی رومادی ئاگادار بکەن و بەگوێرەی توانا و پێویست هاریکاریان بکەن.
ئەو خێزانەی کە وەڵامی پرسیارەکانیان دامەوە خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستانن و سەر بە هۆزی "پالانی"ن و بە بنەماڵەی محەمەد پالانی ناسراون. ماوەی ساڵێک وچەند مانگێکە هاتوونەتە سوید. کاک **ساڵح پالانی** وەڵامەکانی بۆ ناردم.

**پ (پرسیار): ئێوە خەڵکی کام شاری کوردستانن و چەند ساڵ لە ئۆردوگای رومادی نیشتەجێ بوون؟ هۆی چی بوو کە لە رومادیە گیرسانەوە؟ تەمەنتان چەند بوو کاتێک گوازرانەوە بۆ ئۆردوگاکە؟**
و (وەڵام): ئێمە یەکێکین لەو خێزانە گەورانەی کە لە ئۆردوگای ئەڵتاش ژیاووین. ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەمان ١٠ کەسە و پاشناومان پالانیە. ئێمە خەڵکی (سەرپێلی زەهاو)ی سەر بەشاری گەورەی کوردستان (کرماشان)ین لە رۆژهەڵاتی کوردستان. لەساڵی (١٩٧٩)دا، ژمارەیەکی زۆر کوردی رۆژهەڵات کۆچیان کرد بۆ عێراق. بەنسبەت ئێمەوە، کاتێک هاتین بۆ عێراق، لەشارێک بەناوی "چوار کلا"، کە دەکەوێتە نێوانی سنووری عێراق و کوردستانەوە، سێ رۆژێک ماینەوە. پاشان گواسترایینەوە بۆ شارێک بەناوی "سەعدیە" لە نزیک شاری "خانەقین". پاش ٥٠ رۆژ، دیسان کۆچمان کرد بۆ شاری عەربەت کە ٤٠ دەقە بە ماشێن لە شاری سلێمانی خۆشەویستەوە دوورە. دووبارە پاش دوو ساڵ کۆچمان کرد بۆ ناوچەی ئەڵتاش، کە ١٥ کیلۆمەتر دوورە لە شاری رومادی نزیک وڵاتی سعودیەوە. نزیکەی هەزار کیلۆمەتر لە ئوردونەوە دوورە. ئیتر ئۆردوگای ئەڵتاش وەکو ئۆردوگای رومادی ناوی دەرکرد. کاتێک ئێمە ماڵمان بردە ئۆردوگاکە تەمەنم سێ ساڵان بوو، بۆیە هەموو شتێکم لەبیر نایەت. باوکم یارمەتی دام بۆ وەڵامدانەوەی هەندێک لە پرسیارەکان. هۆی هەڵاتنی ئەو کوردانەش



وێنەیەک لە ئۆردوگای ئەڵتاش

ئەوە بوو کە پاش هاتنە سەرکاری خومەینی، لەترسی گیانی خۆیان ئاوارە بوون چونکە هەموویان کوردپەروەر و نەتەوەپەروەر بوون. ئەوە بوو رژێمی ئێران کەوتە راونان و تۆقاندن و تەنانەت زیندەبەچاڵکردنی کوردان. ئەگەرچی لەسەرەتادا خومەینی خۆی بە رادیۆ گوتبووی: "کوردیش موسڵمانن و پێویستە ئەوانیش مافی خۆیان پێ بدرێت"، کەچی پاش ٦ – ٧ مانگ لە بڕیارەکەی خۆی پەشیمان بوەوە و وتی: "هەرکەسێک کورد بکوژێ دەچێتە بەهەشت". ئەوە بوە هۆی ئەوەی کە ئەو هەموو کوردە هەزارە کۆچیان کرد بۆ عێراق و لە ئۆردوگای رومادی گیرسانەوە.

**پ: مێژووی دروست بوونی ئۆردوگاکە دەگەڕێتەوە بۆ کەی؟ شێوەی دروستکردنی ئۆردوگاکە چۆن بوو، ئایا خێمە بوو یاخود لەشێوەی خانوو دا لە خشت و بەرد دروست کرا بوو؟**

و: مێژووی دروستکردنی ئۆردوگاکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٨١ – ٨٢ و خەڵکەکەشی هەمووی بەیەک جار لەوێ کۆنەکرابوونەوە، بەڵکو بە چەند جارێک. هەر جارەی عەشیرەتێک دەهات. دانیشتوانەکەی سەر بە چەندین عەشیرەتی کورد بوون. لەسەرەتادا چادر هەبوو. ئەوانەی خۆیان چادریان هەبوو هەڵیاندا و ئەوانەشی نەیان بوو لەلایەن عێراقەوە پێیان درا. پاش نزیکەی ساڵونیوێک خەڵکەکە هەوڵیان دا بە قوڕ خانوو دروست بکەن. ئەو شوێنە دەشت و خۆڵە پەتانێ بوو، هیچ شتێکی تری وەکو هەرێز و دار لێ نەبوو. هەریەکە و بەگوێرەی تواناو پێویست لە قوڕ و خشتی قوڕ خانوویان دروست کرد. هەندێک کەرەسەی پێویستی وەکو دارمان لە شاری رومادی دەکڕی. پاشانیش کە خانووەکان تەواو بوون لەلایەن حکومەتی عێراقەوە تەلبەند کرا و تەنها یەک دەرگایان هێشتەوە، کە سەربازی عێراقی پاسەوانیان دەکرد. لە چەند ساڵی یەکەمدا خەڵکەکە بۆیان نەبوو لە ئۆردوگا برۆنە دەرەوە، بەڵام پاش چەند ساڵێک خەڵکەکە سیمەکەیان بڕی و هەموویان خراپ کرد و هیچی نەما.

**پ: پێداویستییەکانی ژیان، بۆ نموونە ، خواردن و ئاو چۆن پەیدا دەکران؟ دانیشتوانی ئۆردوگاکە، بەتایبەت پیرەکان و ژنان، چۆن کاتیان بەسەر دەبرد؟**

و: لە راستیدا مرۆڤ لە هەرجێگایەک بێت ئەتوانێت ژیان بەسەر ببات، هەڵبەتە بەشێوەی جۆراو جۆر. ئەوانەی پارەیان هەیە لەهەرکوێیەک بن دەتوانن باشترین ژیان بەسەر بەرن. ئۆردوگای ئەڵتاش وەکو قەفەسێک وابوو کەمرۆڤێکی تێدا زیندانی بکەیت و لەکاتی نانخواردندا نانێک و پەرداخێک ئاوی بدەیتێ. بەڵام لەلایەکی ترەوە ناخۆش نەبوو، بەتایبەت کە هەموومان خزم و کەسوکار و عەشرەتی یەکتر بووین. هەر لەبەر ئەوەش بوو مرۆڤ هەستی بە نامۆیی نەدەکرد. تەنها دووریی و غەریبیی نەتەوە نەبێت بۆ ئەو کەسەی نەتەوە پەروەر بووبێت. پێداویستیەکانی ژیان، وەکو نان و ئاو وکارەبا و جلوبەرگ و هەندێک شتی تر، پێش شەری عێراق و ئەمریکا بەئاسانی دەست دەکەوتن. پێش شەڕەکە پارەی عێراقی بە قیمەت بوو، پاشانیش دەوڵەتی عێراق بەگوێرەی ژمارەی خێزانەکان پارەی ئەدا بە ئاوارەکان. خێزانەکان هەر دوو مانگ جارێک ٢٤٠ دیناریان وەردەگرت و سەڵتەکانیش ٨٠ دینار. دیارە ئەو پارەیە بەشی هەموو شتێکی دەکرد. بەنسبەت ئاوەوە، لەسەرەتادا خەڵکەکە بە قابلەمە ئاوی دەکڕی، پاشان لەلایەن دەوڵەتەوە لەبەینی هەر دوو گەڕەکدا لولە ئاوێکیان راکێشا کە مەتر و نیوێک لەژێر زەویەوە بوو بۆ هەموو خەڵکەکە. دواتر خەڵکەکە هەریەکەو لەلای خۆیەوە کونیان کردە بۆریەکان و ئاویان

هەڵدەکێشا. هەڵبەتە هەمیشە کێشەی ئاو هەبووە و تا ئێستا بەشی پێداویستیەکانی خەڵکی ناو ئۆردوگاکە ناکات. بەنسبەت کارەباوە تا ئەو کاتەی شەڕەکە دەستی پێ نەکردبوو زۆر باش بوو، بەڵام دوای شەڕەکە بەتەواوی وێران بوو. وای لێهات لە شەو و ڕۆژێکدا تەنیا سێ کاتژمێر کارەبا هەبوو. لە تاوستاناندا پلەی گەرمیی دەگەیشتە ٤٠ پلەو خەڵک ناچار دەبوو کە سەهۆڵ بکڕێت بەقاڵب. قاڵبێک سەهۆڵ لەم دوایانەدا گەیشتە دوو تا سێ هەزار دینار، بەڕاستی ژیان گەلێک سەخت بوو.

پیرەکان تا رادەیک خۆشیان رادەبوارد. بازاڕێکی زۆر گەورە و خۆش هەبوو پێیان دەگوت بایعەکە. ئێ خۆ بەلای منەوە لەبازاڕی کوردیش خۆشتر نیە لە دونیادا. بەتایبەت عەسران و پێش خۆرنشین و مەیدانی تەلا فرۆشەکە. ئەو پیرانەش کە حەزیان لەو بازاڕە نەبوایە لە پاڵ مزگەوتی ئۆردوگاکەوە کاتی خۆیان بەسەر دەبرد. ژنانی ئۆردوگاکەش بەخۆشی کاتیان بەسەر دەبرد، بگرە لە ئەوروپا خۆشتریش. لە هەر گەڕەکێک کۆمەڵ کۆمەڵ کۆدە بوونەوە و دەستیان دەکرد بە وتووێژ و کێچێکیان دەکرد بەگایەک.

**پ: پێداویستیەکانی تەندروستی وەکو پزیشک (دوکتۆر) و دەرمان، پاکوخاوێنی ئۆردوگاکە چۆن مەیسەر دەکرا؟ ئەو ژنانەی کە منداڵیان دەبوو کێ هاریکاری دەکردن؟ کەس هەبوو لەکاتی منداڵ بووندا گیانی لەدەست بدات؟**

و: جێگاکە کەمێک بەرەو باشبوون چوو. دەوڵەتی عێراق چەند خانوویەکی دروست کرد بۆ دوکتۆر و دەرمانخانە و دایرەی موخابەرات و ئەمن و ئیستخبارات بۆ ئەو هەموو خەڵکە. جا ئەگەر یەکێک تەندروستی خراپ بوایە دەچوە لای ئەو دوکتۆرە و هەر لەوێش دەرمانی وەردەگرت. ئەگەر کەسێکیش زۆر خراپ بوایە لەلایەن ئەو دوکتۆرەوە پسولەیەکی بۆ دەکرا بۆ نەخۆشخانەی رومادی. لەوێ چارەسەری نەخۆشەکەیان دەکرد، ئەگەر چاری بکرایە. هەرکەسێکیش بچوایە دەبوو پارەیەکی چاک بدات بە دوکتۆر و حەرەس و باقی ئەو خەڵکەی کەچارەسەری نەخۆشەکەیان دەکرد. پاش چەند ساڵێک رێکخراوی خاچی سوور جێگای دوکتۆرەکەی بەتەواوی چاک کردو ئەمبولانس و هەندێک شتی تریشیان هێنا. کاتی سەردانی دوکتۆریش لە (٩)ی بەیانییەوە تا ٢ پاشنیوەڕۆ بوو. خەڵکەکە خۆیان سەرپەرشتی پاکوخاوێنی ئۆردوگاکەیان دەکرد. ئەو ژنانەی کە حامیلە بوون، زۆربەیان نەدەبرانە لای دوکتۆر، بەڵکو لەلایەن ئەو ژنە پیرانەی کە لەو کارەیان دەزانی هاریکاری دەکران. بۆ نموونە یەکێک لەو ژنانەی بەم کارانە را دەبوو دایکی دایکم بوو. لە کوردەواری خۆماندا بەم ژنانە دەڵێن "تاوکەبر". لە دوای شەڕی عێراق و ئەمریکاوە، زۆر ژن لەکاتی منداڵ بووندا گیانیان لەدەست دا، یاخود بەهۆی کەمیی داودەرمانەوە منداڵەکانیان دەمردن و توشی زۆر بەدبەختی دەبوون. دەرمان بەجارێک کەم بوو بووەوە. هەندێک کەس لە ئۆردوگاکەدا دوکانی دەرمانفرۆشیان کردەوە و کاسپیان پێوە دەکرد. یەکێک لەو ژنانەی کەبەسەر منداڵ بوونەوە مرد خزمێکی خۆم بوو. منداڵەکەی ماوە و ئێستا تەمەنی ٤ یان ٥ ساڵ دەبێت.

**پ : رادەی مردنی منداڵ لە ئۆردوگاکەدا چەند بوو؟ ئەوانەی دەمردن لەکوێ دەتان ناشتن؟**

و: پێش هەمووشتێک دەمەوێت پێتان بڵێم کە منداڵ گەورەترین هیوای مرۆڤە. بەڕاستی رادەی مردنی منداڵان لە ئۆردوگاکە زۆر بوو. گەلێک هۆ هەبوون کە دەبوونە هۆی مردنی منداڵەکان: نەبوونی دەرمان، بوون بەژێرماشێنەوەو گەلێک هۆی تر. کاتێک منداڵەکان نەخۆش دەکەوتن پێویستیان بە دەرمان هەبوو. ئەوە بوو خەڵکەکە فەقیر بوون و توانایان نەبوو، چونکە دەرمانەکان زۆر گران بوون و لە کڕین نەدەهاتن. کاتێکیش منداڵێک دەمرد بەشێوەی ئیسلامی دەیان ناشت و دەیان بردە قەبرسان. لە ئۆردوگاکەدا چەندین قەبرسان هەبوون، پیاو، ژن، منداڵ هەرکەس بمردایە لەو قەبرسانانەدا دەیان ناشتن. جارێک سێ منداڵ یاریان بەمینێک کردبوو، مینەکە تەقیبوەوەو هەرسێکیانی کوشتبوو، دوانیان برا بوون، ئەویتریشیان تاقانە بوو. هەر کەسێک کۆچی دوایی بکردایە تا سێ رۆژ پرسەیان بۆ دادەنا. پیاوەکان لە مزگەوت و ژنانیش لە چادرێکدا.

**پ: پەیوەندی خەڵکەکە چۆن بوو لەگەڵ یەکتری، تا چ رادەیەک هاوکاریی یەکتریان دەکرد؟ هەستی نەتەوەیی و کوردپەروەریی چۆن بوو لە ناویاندا؟**

و: لەساڵەکانی ٨١ و ٨٢ ژمارەی دانیشتوانی ئۆردوگاکە دەگەیشتە نزیکەی ٤٠ هەزار کەس. بەڵام لە دوای ساڵی (١٩٩٠)وە ژمارەی دانیشتووانی ئۆردوگاکە بەرەو کەمبوونەوە دەچوو. چونکە ژیان تا دەهات بەرەو سەختی دەچوو،.خەڵکەکە زۆربەیان دەگەڕانەوە بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان و هەندێکیش بەرەو وڵاتانی رۆژئاوا ئەویان جێ دەهێشت. لەساڵی (١٩٩٧)دا ٢٧ هەزار کەس مابوو لە ئۆردوگاکە. دانیشتوانی ئۆردوگاکە لەخەڵکی سەر بەم عەشیرەتانە پێکهاتبوو ( تایشەی، باواجانی، قوبادی، قەڵغانی، گاخۆری، قادری، نەیلکی، ئەلیاری، ئەلیاسی، نێرژی، هەورامی، داریزەنگەڵی، قەڵخانچەک، وڵەبەگی و جوانرۆیی). ئەم عەشیرەتانە هەموو ژن و ژنخوازی کەوتۆتە ناویانەوە و هەمووکات پەیوەندیان لەگەڵ یەکتر هەبوو.خەڵکەکە زۆر هاریکاری یەکتریان نەدەکرد. چونکە ژیانی خەڵکەکە بەسەختی دەچوو بەڕێوە. زۆربەی خەڵکی کوردیش هاریکاری یەکتر ناکەن. جا گرنگ نیە کوردی کام بەشی کوردستان بێت، هیچ کاتێک حەز ناکەین هیچ کوردێک سەرکەوتوو بێت. هەمان کات هیچ کەسێک نیە لە دونیادا هەستی نەبێت بۆ نەتەوەکەی خۆی، مەگەر نەتەوە پەروەر نەبێت. خۆشترین جێگا ئەوەیە کە مرۆڤ بتوانێت لە وڵاتی خۆی لە ناو نەتەوەی خۆیدا ژیان بەسەر بەرێت. هیچ شتێک ناگاتە نەتەوە بۆ مرۆڤ، بەڵام بەداخەوە، ئێمە دەسەڵاتمان نییە. بەڕاستی هەموو خەڵکی ئۆردوگاکە هەستی نەتەوەیی و کوردپەروەرییان هەبوو، بەڵام ژیانە سەختەکەی ئەو ئۆردوگایە هەموو شتێکی لەبیر خەڵکەکە بردبووەوە. خێزانەکان زۆر گەورەبوون، بۆ نمونە یەکێک لەو خانەوادانە ئێمە بووین کە ژمارەمان ١٠ کەس بوو.

**پ: دەوری پارتە کوردییەکان چۆن بوو؟ پەیوەندی خەڵکەکە لەگەڵ پارتەکاندا بەهێز بوو یان نا؟**

و: بەڕاستی لە ئۆردوگای ئەڵتاش لە هەموو جۆرە خەڵکێکی تێدا بوو. پەیوەندی لەگەڵ هەموو پارتە کوردییەکان هەبوو، بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە پەیوەندی بە حزبی دیموکراتی کوردستانەوە هەبوو. زۆریش بوو لەو خەڵکە پەیوەندی بە موجاهیدینەوە دەکرد. لە کاتی درووستکردنی ئۆردوگاکە، هەندێک خەڵک، کە پەیوەندییان بە حزبی دیموکراتەوە هەبوو، جێگایەکیان درووست کرد بۆ گرتنی جەژنە کوردییەکانی وەکو (٢٥)ی گەلاوێژ، (٢٦)ی سەرماوەز، (٢)ی رێبەندان و نەورۆزی خۆشەویست و باقی جەژنەکانی تر. هەر کاتێک یەکێک لەم جەژنانە یاد بکرایەتەوە خەڵکەکە ئەوەی سەر بە حیزبی دیموکرات بوایە بە ژن و منداڵەوە بەشداریان دەکرد. لە کاتی جەژنەکاندا چار جارێک دوکتۆر **خەڵەقی** بەشداری دەکرد. جەژنەکەش بەگۆرانی وشانۆ و وتار و شیعر یاد دەکرایەوە. بەتایبەت جەژنی گەورەی کورد نەورۆز، گەورەترین جەژنی ناو ئۆردوگاکە بوو. بۆ نمونە، لەنەورۆزدا لە هەموو ماڵێک ئاگر

دەکرایەوە و لە شەودا خەڵکەکە ئاگرەکەیان بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە. بەڵام لەکاتی شەهید بوونی دوکتۆری گەورەمان ئەبدولڕەحمانی قاسملو لە هەموو خانەوادەیەک فاتیحاخوێنیی دانرا. کاتێک دەوڵەتی عێراق باشووری کوردستانی داگیر کردەوە هەموو خەڵکەکە نارەحەت و خەفەتبار بوون. کاتێکیش کوردستان ئازاد کرایەوە خۆشی کەوتەوە ناو خەڵکەکە. بە هێزترین پەیوەندی حزبی دیموکرات هەیبوو. کۆمەڵەش هەموو کاتێک جەژنی دەگرت بەڵام نازانم جەژنەکانیان لە چ کاتێک دابوون. بەڵام کۆمەڵەش پەیوەندی زۆر هەبوو لەناو ئۆردوگاکەدا. زۆربەی خەڵکی ئەو ئۆردوگسایە، بەتایبەت لاوەکان، دەچوونە لای حزب و پێشمەرگایەتیان دەکرد. هەبوو ٢ تا ٣ ساڵ پێشمەرگایەتی دەکرد. هەشە هەتا ئێستاش خەبات دەکات و هەر بەردەوامە.

**پ: منداڵان لە قوتابخانە بە چ زمانێک دەرسیان دەخوێند؟ ئایا کچانیش بۆیان هەبوو بخوێنن؟ خەڵکەکە چۆن لەگەڵ دنیای دەرەوەدا پەیوەندیان دەگرت؟**

و: حکومەتی عێراق ڕێگای خوێندنی زمانی کوردی و جلوبەرگی کوردی لێ نەگرتین. پێش شەڕی عێراق و ئەمەریکا، هەر عەشیرەیەک قوتابخانەی خۆی هەبوو، کە ٤٠ تا ٥٠ منداڵ بەزمانی فارسی و چەند زمانێکی تر، تا پۆلی حەوت دەرسیان تێدا دەخوێند. قوتابخانەکان خۆمان لە قوڕ دروستمان کردبوون و مامۆستاکانیش هەر هی خۆمان بوون. پێش شەڕی عێراق و ئەمریکا تەنها خاچی سوور هەبوو، بەڵام دوای شەڕەکە نەتەوە یەکگرتووەکانیش چەند قوتابخانەیەکیان دروست کرد. مامۆستاکانیش لەسەر حسابی ئەوان بوون. ئەوکاتەش منداڵەکان بەچەند زمانێکی وەکو عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی ئەیان توانی دەرس بخوێنن. لەدوای ساڵی (٩٥)یشەوە منداڵەکان بەکوڕ و کچەوە ئەیان توانی لە قوتابخانەی عەرەبەکاندا لە ڕومادی بە عەرەبی بخوێنن. بەڕاستی کچە قوتابی لە ئۆردوگاکەدا زۆر بوو، تەنانەت مامۆستای ژنیشمان هەبوو بۆ هەرسێ زمانی کوردی و ئینگلیزی و فارسی.
کاتێک UN بارەگای کردەوە لە ئۆردوگاکە و خەڵکەکە زانیان ئەتوانن لەڕێگای ئەوانەوە بگەنە هەندەران، وردە وردە لێیان نزیک بوونەوە. UN وەرەقەیەکیان ئەدا بەناوی (کێس یان فۆرم). پاش ئەوەی پڕمان دەکردەوە بە ئینگلیزی، دەمان دانەوە و دوای چەند مانگێک وەڵام دەهاتەوە و گفتوگۆمان لەگەڵ دەکرا. بەو شێوەیە خەڵکەکە زۆربەی پەیوەندی بەدنیای دەرەوە گرت.

**پ: کاروباری ئۆردوگاکە چۆن هەڵ دەسوڕا، لە لایەن حکومەتی عێراقەوە، یاخود خەڵکەکە خۆیان سەرپەرشتییان دەکرد؟ هەڵسوکەوتی سەربازە عێراقیەکان چۆن بوو لەگەڵتان؟**

و: کاروباری ئۆردوگاکە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بەڕێوە دەچوو. هەر مانگێ جارێک خواردن دابەش دەکرا. UN لەلای خۆیەوە بەدوو مانگ جارێک خواردنی دابەش دەکرد. کاتی دابەشکردنەکە بە نۆرە بوو، عەشیرە دوای عەشیرە. هەر عەشیرەیەکیش نوێنەری خۆی هەبوو بۆ دابەشکردنی خواردنەکە چ لای UN و چ لای عێراق، بۆ نموونە یەکێک لەو نوێنەرانە باوکی من بوو. موخابەراتی عێراقی زوڵمی زۆریان لەخەڵکەکە دەکرد و زۆربەی خەڵکەکەیان کرد بوو بە جاش. هەندێک کە پارەیان نەبوو پارەیان ئەدانێ تا ببن بە جاش، هەندێکی تریان ناچار دەکرد، ئەگەر جاشێتی نەکردایە دەیان خستە بەندیخانەوە. پێش شەڕەکە هەڵسوکەوتی سەربازەکان خراپ نەبوو. دوای ئەوە خەڵکەکە ناچار بوون بۆ بژێوی خۆیان بچنە دەرەوەی ئۆردوگاکە، چونکە پارەکە بەشی نەدەکرد. بۆ چونەدەرەوەکەش پێویست بوو بەرتیل بدەیت. ئیتر خەڵکەکە بەو جۆرە کاسپیان دەکرد. کە لە سەیتەرەکانیش دەیان گرتین دەیان وت ئێوە بۆتان نیە بچنە دەرەوە، ناچاریان دەکردین پارە بەوانیش بدەین.

**پ: کاتێک دەچوونە ناو عەرەبەکان بۆ کاسبیکردن، هەڵوێستی ئەوان چۆن بوو بەرامبەرتان، ئایا کرێکارە عەرەبەکان هاوکاریان دەکردن؟**

و: خەڵکی ناو ئۆردوگاکە هەموو جۆرە کاسپیەکیان دەکرد: وەکو کڕین و فرۆشتنی زێڕ، پارچە فرۆشتن، پێڵاوی کۆنە کڕین، قاپوقاچاخ فرۆشتن. بەڵام پیاوە عەرەبەکان زۆر لەگەڵمان خراپ بوون. ڕاستە لەهەموو شوێنێک چاک و خراپ هەیە، بەڵام عەرەبەکان ئەوەندەی گوێیان درێژ بوو نەفام بوون. ئەوان کوردی باشوور و ڕۆژهەڵاتیان بە یەک چاو سەیر دەکرد. ژنە عەرەبەکان هەتا بڵێی باش بوون لەگەڵماندا. لەناو ئۆردوگاکەدا خەڵکانی خراپ هەبوون، بەڵام عەرەبەکان وایان دەزانی کە هەمووومان خراپین. خەڵکی ئۆردوگاکە ئاژەڵیان دەکڕی و دەفرۆشتەوە و قەسابی و ڕاوەماسییان دەکرد. یەکێک لە ماسیگرەکان من بووم. عەرەبەکان تەنها لەکاتی بەرژەوەندی خۆیاندا هاریکاریان دەکردین. زۆربەی کارەکانیشیان غەش بوو. زۆربەیان هەوڵیان ئەدا کە گیروگرفتمان بۆ پەیدا بکەن. زیاتر لە هەزار کەسی ئۆردوگاکەیان سەربڕیبوو و کوشتبوو. بۆ نموونە یەکێک لەوانە هاوسێیەکی ئێمە بوو کە خاوەنی ١٠ سەر خێزان بوو، چوو بۆ کاسپی. پاش چوار ساڵ زانیمان کە کوژراوە و هەتا ئێستاش لاشەکەی نەدۆزراوەتەوە. ئێستا خێزانەکەی لەیەکێک لە وڵاتە ئەوروپیەکانە. کاتێک کوردێک شەڕی ببوایە لە گەڵ عەرەبێک، ئەگەر لەدەرەوەی کەمپەکە بوایە عەرەبەکان وەکو گەلەگورگ گەلەکۆمەکەیان لێ دەکرد و ئەگەر کوردەکە خەتاشی نەبوایە هەر دەیان کوشت. کاتێک شەڕەکە تەواو دەبوو ئینجا دەهاتن پرسیاریان دەکرد کێ تاوانبار بووە. کرێکارە عەرەبەکانیش بەهیچ جۆرێک هاوکاری خەڵکی ئۆردوگای ئەڵتاشیان نەدەکرد.

**پ: ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان UN هاوکاری پەنابەرەکانیان دەکرد؟ ئیا ئێستا خەڵکێکی زۆر ماوە لە ئۆردوگاکە و چارەنووسیان بەچی دەگات؟ پەیوەندی ئێوە لەگەڵ هاوڕێ و کەسوکارەکانتاندا چۆنە؟**

و: ئەو کاتەی ئێمە لە ئۆردوگای ئەڵتاش بووین، لەهەر وڵاتێکەوە (وەکو سوید، نەرویج، فنلەندا و وڵاتەکانی دیکە) لەگەڵ (UN)دا کەسێک یان چەند کەسێکیان دەنارد بۆ ئۆردوگاکە، بۆ پرسیارکردن لە خەڵکەکە بۆ ئەوەی بتوانن سەفەر بکەن بۆ هەندەران. جارێک کوردێکی دانیشتووی ئوسترالیا بەناوی **نەهرۆ جەلال شێرە**، وڵاتی ئوسترالیای ئاگادار کرد بوو لە باری کەمپەکە بۆ هاوکاری دانیشتوانی ئۆردوگاکە. ئوسترالیا داوای لە دەوڵەتی عێراق و UN کرد کە ئەیانەوێت بەجارێک ١٠ هەزار کەس بەرن بۆ ئەو وڵاتە. خەڵکەکە زۆر دڵخۆش بوون، بەڵام (UN)ی بەغداو موخابەراتی عێراقی ڕازی نەبوون. ئێستا UN بەباشی هاریکاری خەڵکەکە ناکات و ڕازیان ناکات. بەڵام خەڵکەکە ناچارن کە چاوەڕێ بکەن، چونکە هیچ دەسەڵاتێکیان نیە. ئەو کاتەی ئێمە هاتین بۆ سوید، ژمارەی دانیشتوانی خەڵکی ناو ئۆردوگاکە دەگەیشتە ٢٠ تا ٢٤ هەزار کەس. بەڵام ماوەیەک لەمەوپێش موخابەراتی عێراقی زۆربەی خەڵکەکەی ناردۆتەوە بۆ کوردستان. ئەوەی توانای چاوەڕێکردنی (UN)ی هەبێت دەمێنێتەوە و ئەوی تریش چاوەڕێی گەڕانەوە دەکات بۆ کوردستان.

# دکتۆر خەلیقیی دەربارەی ئۆردوگای ئەڵتاش چی دەڵێت؟

**دکتۆر خەلیقی** یەکێکە لەوانەی کە سەردانی ئۆردوگای ئەڵتاشی کردووە. بۆ خستنە پێشچاوی هەندێک زانیاریی تر دەربارەی ئەم ئۆردوگا بەسەرنەکراوەیە، ئەم پرسیارانەمان ئاراستەی ناوبراو کرد، کە لە خوارەوە لەگەڵ وەڵامەکانی "د.خەلیقی"دا دەیان خوێنیتەوە.
١٩٩٨/١٢

**•هەزاران کچ و کوڕی بێبەشکراو لە خوێندن چوونە قوتابخانە و بە زمانی زگماکیی خۆیان دەیان خوێند**
**•گشت خەڵکی ئۆردوگا ئاگادارن کە لە چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمە جۆراوجۆرەکانی ئۆردوگادا چالاک و سەرکەوتوو بووم**
**•ناساندنی خێڵی قەڵخانی بە ناموسوڵمان برینێکی تری لە لەشی ئەو پەیوەندییە ناپیرۆزەدا دروست دەکرد**

**پ: ئەم ئۆردوگایە چۆن درووست بوو، ژمارەی خەڵکەکەی چەند بووەو چۆن لە گۆڕاندابووە؟**
و: لە سەرەتای شەڕی ئێران و عێراقەوە ساڵی ١٩٨٠، عێراق لە ناوچەی زەهاوەوە هێرشی کردە سەر سنووری دەسکردو بێ لەمپەرێکی بەرچاو ناوچەکەی داگیر کرد. دەسبەجێ وێرانکردنی گوندەکان و شاری "قەسر"ی تەختی زەوی کرد. کۆمەڵێک خەڵکی راپێچ کرد و دەیان کەسی بێ سەروشوێن کرد. لە بەرپەچدانەوەی دواتری ئێراندا، ئەم بەشە لە کوردستان لە لایەن هەردوو لاوە کەوتە ژێر رەهێڵەی تۆپ و کاتیوشا و گوند و کۆخ و شاخ و دەوەنی ناوچەکانی: قوایی، باوەجانی، تایشەی، کویک، وقەڵخانی و هی تر، کاولکران و خەڵکەکانیان پەنایان بردە بەر شاخ و دەوەن و ئەشکەوت. بەرە بەرە کاری کشتوکاڵ لە گەڕ کەوت و ناوچەکە کەوتە ژێر گەمارۆی ئابوورییەوە. پێش ئەو هێرشە، بەعسییەکان بەهۆی "**سەردار جاف**"ەوە کۆمەڵێک خەڵکی ئەو ناوچەیەیان چەکدار کردبوو. لافی ئەوەیان بۆ لێدا بوون کە بەم زووانە رژێمی ئێران دەڕوخێت و دەیان کەن بە دەسەڵاتداری ناوچەکە. هەر بۆیە داردەستی رژێمی بەعس بەم جۆرە لە ئاکامی تەنگەبەربوونی مەیدانی ژیان و پروپاگەندەی سوپای بەعسدا، بەشێکی زۆری لە خەڵکەکە بە زۆر و بە رمزا بەرەو سنووری دەسکردی باشووری کوردستان کۆچ پێ کرد. هەندێکیان لە سەر سنوور مانەوە و زۆربەیان لەژێر چاودێریی موخابەراتی عێراقداو دور لە چاوەدێریی UN بەرەو (ئەڵتاش)ی رومادی راپێچ کران و لەو بیابانە قاقرە بێ دەرەتانەدا دانران. ئەوانیش بە ناچار ملیان لە کوخ دروستکردن نا و بە شێوەی دەورەی کویلەداری بۆ نزیکەی ٤٧ هەزار کەس شارۆچکەیەکی بێ سەرەوبەرەیان دروست کرد.
بەشێکی کەم لەم خەڵکە چەکی (سەردار جاف)یان هەڵگرت و بوونە سیخوڕی بەعس و ئەوانی دیکە ملیان کرد بە پەتی ئاوارەیی و کوڵەمەرگیدا.

**پ: ئایا پارتەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان، دیموکرات و کۆمەڵە، بەرنامەیان چی بووە بۆ ئەم ئۆردوگایە؟**
و: هەردوک پارتی دیموکرات و کۆمەڵە، بێجگە لە موجاهیدین و چریک و رێگای کرێکار، هاتووچۆی ئەو ئۆردوگایەیان دەکرد. بە پێی توانا پەیرەوپرۆگرامی خۆیان رادەگەیاند. شانەو حەوزی رێکخراوەییان ساز دەکرد. بۆ نمونە، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران توانی لە چەند دەورەدا پلەی شعوری دەیان کەس لە لاوەکان و نیشتیمانپەروەرانی ئەو خەڵکە لە فێرگەی سیاسی نیزامی خۆی دا بە دانانی دەورەی فێرکردن و راهێنان

**پ: بیرەوەرییەکی ناخۆش کە کاریگەری لەسەر ئێوە دانابێت و نەتوانن لە یادی بکەن، ئەو رۆژەی کە ئۆردوگاکەتان بەیەکجاری بەجێ هێشت هەستان بەچی دەکرد؟**
و: بەڕاستی مرۆڤ لەهەر کوێیەکی دنیا بێت، بیرەوەرییە خۆش و ناخۆشەکانی لەیاد ناکات، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر ژیانەکەی ناخۆشیش بێت. ئێمە نزیکەی ١٦ ساڵ لەو ئۆردوگایە ژیانمان بەسەر بردووە، بیرەوەریی ناخۆشمان زۆرن و قەت ناتوانین لەیادیان بکەین. زۆربەی ئەوانەی هاتونەتە ئەورووپا، خزم و کەسوکاریان لەوێ بەجێماوە. ئێمە زۆربەی کەسوکارەکانمان لەوێ بەجێ ماوە و هەمیشە پەیوەندیان لەگەڵ دەکرین، جا بە نامە و وێنە بێت یاخود بە تەلەفون، هەمیشە لە باشی و خراپی تەواوی ئۆردوگاکە دەپرسین. هیوادارم کە خراپە نەیەتە رێگەی دانیشتوانی ئۆردوگاکە. ئەو رۆژەی ئۆردوگاکەمان بەجێ هێشت، یەکجار هەستمان بە غەریبایەتی دەکرد، چونکە زۆربەی خزم و کەسوکارەکەمان بەجێ دەهێشت. لەئۆردوگاکەدا زۆر هەستمان بەغەریبایەتی نەدەکرد چونکە هەموو خزمەکانمان لەوێ بوون، تەنها دووری نەتەوەکەمان بووین و غەریبیمان دەکرد.



وێنەیەک لە ئۆردوگای ئەلتاش

بەرێتە سەرو بیانکێشێتە مەیدانی خەباتی نەتەوایەتییەوە. هەندێکیان بوونە پێشمەرگەو چەند کەسیشیان لەو پێناوەدا گیانی خۆیان بەخت کرد.

لە ئۆردوگا، کۆمیتەی حیزب دانراو تێکۆشان بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان و پتەوکردنی ریزەکانی کۆمەڵایەتی خەڵک دەستی پێ کرد. بەدانانی کۆمیتەی ژنان، بۆ یەکەم جار ژنان لەو بەشەدا لە رێکخراوی خۆیاندا چالاکییان نیشاندا. زیاتر لە بیست قوتابخانە لە ئۆردوگادا دامەزرا. کتێبی سەرەتایی کوردی و کەرەسەی دیکە بە هاریکاری خەڵک و UN دابین کرا و بە بەشداریی خوێندەواران لە وانەوتنەوەدا قوتابخانەکان وەگەڕکەوتن. هیچ مەرجێک بێجگە لە توانای وانەوتنەوە بۆ بەشداری خوێندەواران بۆ مامۆستایی رەچاو نەکرا. بەم جۆرە هەزاران کچ و کوڕی بێبەشکراو لە خوێندن چوونە قوتابخانە و بە زمانی زگماکیی خۆیان دەیان خوێند.

**پ: ئایا لە هیچ بڵاوکراوەیەکی ئەو دوو رێکخراوەدا، یان بڵاوکراوەیەکی تردا باسی باری ژیانی خەڵکی ئەم ئۆردوگایە کراوە؟ ئەگەر "نا" کامانەن؟**

و: ئەوەی لە بیرم مابێ، لەم دوایانەدا لە بڵاوکراوەکانی حیزبی دیموکراتدا، باسی ژیانی تاڵی ئەو خەڵکە کراوە. بڕوانە رۆژنامەی کوردستان ژمارە (٢٦١)

**پ: ئایا لە سەرکردەکانی ئەم دوو رێکخراوە هەیە کە لەو ئۆردوگایەدا بێت یان بووبێت؟ ئەگەر "نا" کێ بوون؟**

و: حیزبی دیموکرات لە ساڵی (١٩٨٣)وە بە بەرنامەو لە چەند نۆرەدا بەهۆی ناردنی ئەندامەکانی کۆمیتەی ناوەندی خۆیەوە چ بە شێوەی تاکە کەسی وەک هاتوچۆی نوێنەری حیزب لە بەغداد کاک سەید سەلامی عەزیزیی، شەهید غەفوری هەمزەیی، کاک حەمە نەزیف قادریی و چ بە شێوەی کۆڕ، بەسەری کردونەتەوە. یەک لەوانە بۆ خۆم وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، دوو جار لەگەڵ کۆڕی هونەری حیزب و تیمی تەشکیلاتی و کۆڕی پەروەردەو فێرکردن چوومەتە ئۆردوگاو بە گشتی نزیک یەک مانگ لەوێ ماومەتەوە.

**پ: لەو چاوپێکەوتنەدا کە لەگەڵ ساڵح پالانی کراوە ناوی کۆمەڵێک خێڵ و پەیوەندی خێڵایەتی هاتووە. ئایا ئەم پەیوەندییە تا چ رادەیەک پەیوەندی بە ئۆردوگاکەوە هەبووە؟**

و: پەیوەندیەکە خڵتەی ژیانی رابووردووی خەڵکی ناوچەکە بوو، هێشتا بەهێز بوو. کێشەی نێوان خێڵەکان لە چوارچێوەی داب و نەریتی خێڵایەتیدا گەلێک سەرسوڕهێنەر بووە. دیارە گیروگرفتە بێ پسانەوەکانی ئۆردوگاش، برینی ئەو کێشەیەیان ناسۆرتر کردبوو. لەبەرئەوە هەندێک لە ئەندامەکانی هەندێک لە هۆزەکان خوێندەوارو دەم لە پێش بوون و لە لایەن موخابەرات و (UN)ەوە بەرپرسیاریی هەڵسوڕاندنی کاروباری ئۆردوگایان پێ دەسپێردرا، خێڵەکانی دیکە لەبەر نەبوونی ئەو پەسن و دەسەڵاتە لەواندا هەستیان بە بەشخوراویی و لارەملێ دەکردو لەگەڵ ئەندامانی دیکە رکەبەرایەتییان دەکردو ئەمەش دەبووە ماکەی کێشەیەکی نوێ. بێجگە لەوە بیری ئایینی و ناساندنی خێڵی قەڵخانی بە ناموسوڵمان و هەڵوێستی ناحەزی هەندێک بەناو موسوڵمانی لەو چەشنە، برینێکی تری لە لەشی ئەو پەیوەندییە ناپیرۆزەدا دروست دەکرد.

**پ: تۆ یەکێک بوویت لەو کەسانەی حیزبی دیموکراتی ئێران کە**

# ئەی سوتەمەنی و قوربانیی مێژووەکە دەڵێ چی!

زمارەیەکی زۆر کەس ژیانیان لە پێشمەرگایەتییدا سەرف کردووە و جوڵانەوە چەکدارییەکان لەسەر خۆیان و کەسوکاریان کەوتوون. هەندێک لەمانە ئێستا گەشتونەتە دەرەوەی وڵات. بەڵام مەرج نییە ئێستایان توانیبێتی لە چنگ ڕابووردویان دەرباز بووبێت. هەر یەکە و کۆمەڵێک ناسۆر و بیرەوەریی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، کە کەم و زۆر ڕەنگە ژیانی ئەمڕۆشیانی نائاسایی کردبێت.

ئەم مرۆڤانە خۆیان لەناو ڕووداوەکاندا بوون، کەچی ئەوەی دەنگی دەبیسترێت بەزۆریی هەر نووسەرەکانن، یان ئەوانەن کە بڕیارەکانیان دەرکردووە. ئەی ئەوانەی کە سووتەمەنی و قوربانیی مێژووەکەن دەڵێن چی و چۆن کێشەکانیان دێتە بەرچاو؟ دەرفەت ڕەخساندن بۆ قسەی ئەم مرۆڤانە گەلێک گرنگیی هەیە، لەوانە گرنگیی مێژوویی.

ئێـــــــوە و لوقـــــمـــان شـــاســـــوار و دکــتـــــۆر مـــوشـــيـــر لـــەم ژمـــــــــــارەيـــەدا.

## •یەکێتی بە ملانێی کوردستانیبوون و عێراقیبوونی کۆمەڵەوە گیری خواردبوو
## •ئەوەی ئەمڕۆ هاتۆتە دی بەشێکی گرنگە لەوەی من ئاواتم پێ خواستووە
## •لە مەسەلە گەورەکاندا شانازیی بە یەکێتییەوە دەکەم



ناوم: **لوقمان شاسوار**
جێی لەدایکبوونم: سلێمانی
ـ هەر لە سەرەتای لاوییمەوە تێکەڵاوی کاروباری سیاسی بووم.
ـ لە کێشەی خوێندکاراندا، ساڵی ١٩٨٤، هەڵبژێردراوی خوێندکاران بووم بۆ گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا.
ـ لە کاروباری ڕێکخستنی کۆمەڵە بووم لە ناوچەی تیپی (٥٧)ی سەگرمە. کەم تەمەنترین ئەندامی کۆنفرەنسی (٣)ی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووم، ساڵی ١٩٨٤
.
ـ ڕابەری سیاسیی تیپی (٥٥)ی قەرەداخ بووم.
ـ سەرپەرشتیکەری بەشێکی هێزی گەرمیان بووم لە ناوچەی مەڵبەندی (٣)ی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان.
ـ ئەندامی یەکەمین کۆنفرانسی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان بووم، ساڵی ١٩٩١.

**پ١: کامانەن ئەو پاڵپێوەنەرانەی کە کردتیان بە پێشمەرگەو گیانی بەردەوامبوونیان پێت دەبەخشی؟**

و: پێش پێشمەرگایەتی لە ڕێکخستنی نهێنیی ناوشاردا تێ دەکۆشام. لە بۆردومانەکەی قەڵادزێ لە (١٩٧٤/٤/٢٤)دا برا

---

ئامادەکردن و هاندانیان بۆ تێکۆشان لە مەیدانی خەباتی نەتەوایەتیدا بۆ رزگاربوون لە ئاوارەیی و سڕینەوەی کێشە خێڵایەتییەکان و وەدەسهێنانی پێناسەی نەتەوایەتی. گشت خەڵکی ئۆردوگا ئاگادارن کە لە چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمە جۆراوجۆرەکانی کۆن و نوێی ئۆردوگادا چالاک و سەرکەوتوو بووم. دەتوانم بێژم لەو مەیدانەدا، شوێنی کاریگەرم داناو تا رادەیەکی زۆر پەیوەندییە نادروستە کۆمەڵایەتی و عەشیرەییە کۆنەکانم تێکداو بە هاوکاری خودی خەڵکەکە، پەیوەندی نوێم لە جێی ئەوان دانا. پێم وابوو ئەو گرفتە بەگرێ وگوڵە پڕ لە تەنگ و چەڵەمەیە، بەرهەمی سیستەمی عەشیرەیی فیئوداڵی و بیری دواکەوتووی خەڵکی دوور لە دەرەتانی خوێندن و تێکۆشان بوو بۆ وەدەست هێنانی شعوری بەرزی کۆمەڵایەتی و سیاسی.

**سەردانی ئەم ئۆردوگایەت کردووە، مەبەستت لە سەردانەکانت چی بوو؟ چیت بۆ کراو تەنگوچەڵەمەکانت چۆن دەدی؟**

و: مەبەست لە سەردانەکە، ڕوونکردنەوەی خەڵکی لێقەوماو چەند قەف چەوساوەی ئۆردوگا بوو سەبارەت بە ماف و ویست و داخوازە مرۆڤی و نەتەوایەتییەکان و هۆی ئاوارەبوونمان. هەروەها

گەورەکەمان، بورهان شاسوار، شەهید کرا. ئەم ڕووداوە براکەی ترمان، (عەدنان شاسوار)ی ڕاکێشایە کۆڕی کاری سیاسییەوە و ئەوە بوو لە ساڵی (١٩٧٤)دا پەیوەندی بە کۆمەڵەوە کرد. لەسەر دەستی ئەویشدا (سامان شاسوار)ی برام، ئەوجا من بەشداری تێکۆشان بووین. بە واتایەکی تر: شەهیدبوونی کاکە بورهان ڕاستەوخۆ لەو ناهەقییە بە ئاگای هێناینەوە کە تیایدا دەژیاین. لە ڕێکخستندا هۆشمەندانەتر، بەرفراوانتر، لەو چەوساندنەوەیە ئاگادار بووین، کە بەسەر خەڵک و میللەتەکەمانەوە هەیە. ئەمە لەڕاستیدا پاڵپێوەنەرێکی هەمیشەیی بوو کە لە سەنگەری خەباتدا دەیانهێشتمەوە و گیانی بەردەوامییان دەدایە بەرم.

**پ٢: ئایا پاڵپێوەنەر هەبوو کە وازت پێ لە پێشمەرگایەتیی بهێنێت و دڵت سارد بکاتەوە؟ کامانە بوون؟**

و: مرۆڤ زادەی ئەو زروفەیە کە تیایدا دەژی. بە هەل و مەرجە لەبارەکان گەش و بەتین و بە هەل و مەرجە نالەبارەکانیش خامۆش و سست دەبێت. ژیانی پێشمەرگایەتی ژیانێکی سەخت و قورس بوو، هەل و مەرجێکی زۆر خراپ دەوری تەنیبوو، بەتایبەت ئەو دەمەی من بوومە پێشمەرگە، دەمی شاڵاوی چڕوپڕی بەعس بوو بۆ خەفەکردنی بڵێسەی شۆڕش. بەعس سوودی لە هەل و مەرجی نێودەوڵەتی و ناوچەیی و تایبەت شەڕی خۆی و ئێران بۆ تێپەڕکردنی مەرامە گڵاوەکانی وەردەگرت. ئۆپۆزیسیۆنی کوردیش، یەکێتی لێ دەرچێ، بە عەمەلی نەبوو. یەکێتیش بە دەست ململانێی نێوان کوردستانیبوون و عیراقیبوونی ئەندامەکانی ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە گیری خواردبوو.

ڕەنگدانەوەی ئەم دیاردە زۆر خراپەی ململانێی نێوان ئەندامان لەسەر بیروباوەڕی ئەندامان و پێشمەرگەکان کاریگەر بوو. بۆ ئەوانەی بە دڵ و بە گیان خەباتیان دەکرد، سەرئێشە و ماندووبوونێکی زۆری بەدەمەوە بوو، بۆ هەلپەرستانیش ناز و نیعمەت بوو. بەری ئەم ململانێیەیان بە بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان دەچنییەوە. ئەمانە لەپاڵ شاڵاوی بەعس بۆ وێرانکردنی گوندەکان، گرژکردنەوەی ناوچە ئازادکراوەکان، کەمکردنەوەی ئەو جەماوەرەی کە لە سایەی دەسەڵاتیا دەژیا، کەمارۆدانی ئابووری و هاتوچۆ بۆ ناوچە ئازادکراوەکان، شاڵاوی تۆقاندن لەناو شارەکاندا، بەبەشکردنی کەسوکاری ئێمەی پێشمەرگە، وەدەرنانیان لە ماڵ و حاڵ و زەوتکردنی ماڵ و سامانیان، کۆمەڵێ لەو هەل و مەرجە نالەبارانە بوون کە کاریان دەکردە سەرم و ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد، کە بۆچی ئێمە وا بژین و خەڵکی دیکەش بە جۆرێکی تر؟ بەڵام کە بیرم لە کێشەی کورد دەکردەوە بەوەی کێشەی میللەتێکی چەوساوەیە، کێشەیەکی ڕەوایە، داهاتوو هەر بۆ ئەم دەبێ، ورەم بەرز دەبووەوە. هەروەها پێشم عەیب بوو دەستبەرداری یەکێتی بم، چونکە شەهید، بریندار، پەککەوتە و کەسوکاری ئەمانەی هەبوو... لەگەڵ هەندێ سلبیاتیشدا کە دەمبینین، بەڵام هەر ڕیزەکانی شۆڕشم بەجێ نەهێشت.

**پ٣: ئایا تۆ بەشدار دەبوویت لەو بڕیارانەی کە سەرکردایەتیی هێزەکەت دەی دا؟ ئەگەر "نا" بە چ شێوەیەک بەشدارییت دەکرد؟**

و٣و٤: ئەگەر مەبەست لە سەرکردایەتیی هێز، سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی بێت، دەتوانم بڵێم: نەخێر! چونکە ئاست و جێی کاری من بواری ئەوەی نەدەدا ڕاستەوخۆ وەها بەشدارییەک بکەم. بەڵام چونکە ڕابەری سیاسیی تیپی (٥٥)ی قەرەداغ بووم لە تیپ و مەڵبەندەکەمدا، مەڵبەندی (١)ی قەرەداغ، دەنگی ڕادەربڕین و بڕیاردانم هەبوو. بە نیسبەت تیپەکەوە ڕای ئەوانەی خوار خۆشم وەردەگرت و لە بەردەم لێپرسراوی دیکەی تیپەکەدا دام دەنا. لە هەندێ چالاکیشدا، کە سەرکردایەتی پرسیاری لە مەڵبەند کردبێ و ئەویش بە دەوری خۆی لە ئێمە، دیارە بۆچوونی خۆمان دەربڕیوە. واتە: شێوە میکانیزمێک هاتۆتە ئاراوە، تیایدا کردنی چالاکییەک، یان نەکردنی، یان چۆنیەتیی کردنی، دەرئەنجامی ڕای هەموو ئاستەکان بووە. مەرجیش نییە ئەم پرنسیپە بەردەوام پێڕەو کرابێ، چونکە جاری واش هەبووە فەرمانێ لە مەڵبەندەوە هاتووە و بێ یەک و دوو جێبەجێ کراوە. با ئەوەش لە یاد نەکەم، سەرکردایەتیی یەکێتی ئەوکاتە لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان پێک هاتبوو، کە هەردوو لایان لە کۆنفرانسی ناوچەیی و کۆنفرانسی گشتیدا هەڵدەبژێردران. من کە خۆم ئەندام یان پێشمەرگەیە بوویم و ئازادانە دەنگم بۆ دابن، دیارە بەپێی پرنسیپی پارتایەتی دەبێ ملکەچی بڕیارەکانیشیان بم.

**پ٥: ئایا ئەو کاتە پێت وابوو کە دەبوو تۆش بە شێوەیەک لە شێوەکانی ڕاوەرگرتن بەشدارییت؟ ئەگەر "نا" چ هەوڵێکت بۆ ئەم مەبەستە داوە؟**

و: من ئەگەر بەراوردی ئێستای هەندەران و ئەوکاتەی پێشمەرگایەتیم بکەم، دیارە زۆر شتی زیاتر فێر بووم. ئێستا بە جۆرێکی تر درک بە زۆر شتی ئەوکاتە دەکەم. بڕیارەکانی ئەو کاتەشم بە نامۆ نابینم، چونکە زادەی ئەو تەمەن و ئەزموون و قۆناغە بوون کە خۆم و شۆڕشەکەی پێدا تێپەڕیوە!

**پ٦: ئایا ئەوەی ئەمڕۆ بەرقەرارە ئەوەیە کە تۆ هەوڵت بۆ دەدا؟ لەبەردەمی وەلامەکەتدا هەست بە چی دەکەیت؟**

و: لە لایەک دەڵێم: بەڵێ، ئەوەی ئەمڕۆ هاتۆتە دی بەشێکی گرنگە لەوەی من ئاواتم پێ خواستووە! ڕاستتر وایە بڵێم: لە ڕابردوودا، هەندێ جار، بەگومان بووم لەوەی ئێمە بە هیچ کام لە ئاواتەکانمان بگەین. توانای کەمی ئێمە، باڵادەستیی ڕژێمی عێراق، سڕووشتی دابەشکردنی کوردستان، بارودۆخیی نێودەوڵەتی و...تاد ڕووناکی نەدەهاویشتە دەروونمانەوە، بەڵام دواجار بە هەر شێوەیەک بوو گۆڕانکاری ڕوویدا.

ئامانجی هەرە واقعیی ئێمە ڕامالینی دەسەلاتی ڕژێم بوو لە کوردستانی عێراقدا، کە هاتە دی!

خەباتی ئێمە بۆ دیموکراسی و یەکسانی و بۆ خۆشگوزەرانیی خەڵکی و بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووس بوو. لەم لایەنانەوە ژمارەیەک دیاردە کە ئێستا لە هەندێ لە بەرپرسیاراندا دەیبینم، نەک هەر ئەوە نییە کە من خەباتم بۆ کردووە، بەڵکوو پێچەوانەکەیەتی. هەندێ ڕەفتاری شەخسی، کە پێچەوانەی داب و نەریتی مرۆڤانەیە و لە هەندێ کەس، بەتایبەتی لەوانەی هاوبیروباوەڕمن تێبینی دەکەم، ویژدانم ئازار دەدەن و دەمهەژێنن، بەتایبەتی کە ڕابردووی پڕ لە گیانبازیی هەندێکیان دێتەوە یادم.

**پ٧: ئێستا کە لە دەرەوەی وڵاتی هەستت چییە بەرامبەر ڕوداوەکانی کوردستان و دەتەوێت بڵێیت چی؟**

و: لە مەسەلە گەورەکاندا هەڵبژاردن، پەرلەمان، حکومەتی هەرێم، هەنگاوەکانی ڕووەو بڕیاردانی مافی چارەنووس، شانازی بە یەکێتییەوە دەکەم. پێم وایە، کورتبینیی خەڵکی و دوورەپەرێزی و کەنارگرتنی ڕۆشنبیرانی میللەتەکەم لە وەرگرتنی هەڵوێستی ئازایانە بۆ پشتیوانی هەموو هەنگاوێکی باش، لە هەر لایەکەوە بێت، بۆ ئایندەی میللەتەکەم هەستم دەهەژێنێ و خۆزگەی ئەوە دەخوازم یەک دەست و یەک هەڵوێست پشتیوانی هەق بکەن و بەرانبەری ناهەق بوەستن، کێ و کام لایەن بن.

# دکتۆر موشیر
# دوای ۲۳ساڵ پێشمەرگایەتیی
# دایکی دەمرێ و ناوێرێت بڕواتەوە بۆ کوردستان

**زۆر سوپاستان دەکەم کە منتان بەسەرکردەوە، بە ڕاستی ئەمە دیاردەیەکی دڵخۆشکەرە کە لە تێکۆشەرە دێرینەکانی نەتەوەکەتان دەپرسنەوە و بەم پرسینەوەیەش مێژووی دواڕۆژی گەلەکەمان دەوڵەمەند دەکەن و نەوەی داهاتووش شارەزاتر دەکەن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا زیندووکەرەوەی مێژووە و هیوادارم گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی تریش ڕێبازی گۆڤارەکەی ئێوە پێڕەو بکەن.**

ناوم (موشیر حەمەغەریب ئەمین)ەو بە دوکتۆر موشیر ناسراوم. لە شاری کۆیە چاوم هەڵێناوە و لەناو خێزانێکی شۆڕشگێڕ و کوردپەروەردا پەروەردە کراوم. باوکم ئەندامی حیزبی هیوا و ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە. بەشداریی لە کۆماری (مەهاباد)دا کردووە و لەساڵی (۱۹۷٤)دا بەشداریی شۆڕشی کردووە و دوای هەرەس خۆی و ماڵ و منداڵی دوورخراونەتەوە بۆ خوارووی عێراق، بۆ ناحیەی گرمەی سەر بە شاری فەلوجە و سێ ساڵ دەستبەسەر بووە.

دایکم تا ساڵی (۱۹۷۰)یش ئەندامی حیزبی شیوعی عێراق بووە. سێ برام پێشمەرگە بوون، خۆشم لە ساڵی (۱۹٦٦)دا بووم بە ئەندامی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی سەر بە خوالێخۆشبوو بارزانی و پێنج جار لە لایەنی جەماعەتی مامجەلالەوە گیراوم و زۆر ئازار دراوم. لە ساڵی (۱۹٦۷)دا چوومە ڕیزی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستانی سەر بە بارزانییەوە و وەکو کادێری پزیشکیی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شۆڕشدا دوو دەورەی پزیشکیارم بینیوە. یەکێکیان دوکتۆرە بێسنوورەکان سەرپەرشتیان دەکرد و دووەمیان لە ناوپردان بوو، ٥٠ کەس بۆ ماوەی ساڵێک تێیدا بەشدار بووین و دوکتۆر مەحموود عوسمان سەرپەرشتی دەکرد. دوای بەیانی (۱۱)ی ئازاری ۱۹۷۰، کرام بە لێپرسراوی یەکێتی لاوانی ناوچەی کۆیە. دوو جار بریندار کراوم. جاری یەکەم ساڵی ۱۹۷۲ بە دەستی جاشەکانی سابیری شێخ ڕەقیب لە ناوچەی بەردەڕەش. جاری دووەمیش لە شەڕی ٦مانگەی چیای ماکۆک و خانزادی ڕانییەدا بوو. ئەوە بوو لە (۱۹۷٤/۸/۲۸)دا لە شەڕێکی قورسدا ڕۆژنامەنووسیی بەناوبانگی ئەمریکا میستەر پیتەر بریندار کرا. میستەر پیتەرم بە برینداریی ڕزگار کرد و نەم هێشت دوژمن بیگرێت. لە لایەن سەرۆک بارزانی و مەکتەبی سیاسییەوە، هەروەها لە لایەن خێزان و بنەماڵەی میستەر پیتەریشەوە، خەڵات و سوپاس کرام. پاش هەرەسی ۱۹۷٥ منیش وەکوو زۆربەی کادێر و پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلوول لە ئۆردووگای شارۆچکەی دەبای سەردەشت وەکوو پەنابەر مامەوە و لە مانگی (۷)ی هەمان ساڵدا لە کۆبوونەوەیەکی نهێنی ۲۰۰ کادێری عەسکەری و سیاسی کە بەڕێزان کاک مەسعود و خوالێخۆشبوو کاک ئیدریس تێیدا بەشدار بوون، لە شاری نەغەدە، بەشداریم کردووە. لە (۱۹۷٥/۱۱/۱۱)دا گواستیانیینەوە بۆ ئۆردووگای جەهرومی سەر بە ئوستانی فارس و ماوەی ۸ مانگ وەکو یاریدەدەری پزیشک لە نەخۆشخانەی ئۆردووگادا کارم کردووە و دوایی لە ساڵی (۱۹۷٦)دا گوێزرامەوە بۆ ئوستانی کرمان و لە نەخۆشخانەی مەرکەزیی ئوستاندا کارم کردووە. لە ساڵی (۱۹۷۷)دا، لە ڕێگای کاک د. خالید و کاک ڕەسووڵ مامەند و دکتۆر خدر مەعسوومەوە، پەیوەندییم کردووە بە یەکێتیی نیشتمانی کوردستانەوە. لە ناوەڕاستی (۱۹۷۷)دا لەسەر بڕیاری مەکتەبی سیاسی شەرەفی سەرپەرشتی گشت ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانم لەناو کوردە ئاوارەکانی شۆڕشی ئەیلولدا پێ سپێردرا. لە ساڵی (۱۹۷۸)دا لەسەر بڕیاری مەکتەبی سیاسی گەڕامەوە ڕیزی شۆڕش و وەکو

**پ۱: کامانەن ئەو پاڵپێوەنەرانەی کە کردتیان بە پێشمەرگەو گیانی بەردەوامبوونیان پێت دەبەخشی؟**

و: ئەوەی پاڵی پێوە نام بۆ ڕیزی حیزبایەتی و پێشمەرگایەتی قوتابخانەی ماڵەوەمان بوو. دایکم بە پلەی یەکەم و باوکم و براکانیشم، هەروەها چەوسانەوەی نەتەوەکەم.

**پ۲: ئایا پاڵپێوەنەر هەبوو کە وازت پێ لە پێشمەرگایەتیی بهێنێت و دڵت سارد بکاتەوە؟ کامانە بوون؟**

و: من لە ساڵی (۱۹۹۰)ەوە بە هۆی باری ئەوسای کوردستانەوە وازم لە خەباتی چەکداری هێناوە و وەکوو تێکۆشەرێکی بێ چەک لە سوید دانیشتووم. بێگومان لە کاتی خۆیدا ئەگەر تەمەن ڕێگە بدا ڕوونی دەکەمەوە هۆی وازهێنام لە پێشمەرگایەتی چی بوو.

**پ۳: ئایا تۆ بەشدار دەبوویت لەو بڕیارانەی کە سەرکردایەتیی هێزەکەت دەی دا؟ ئەگەر "نا" بە چ شێوەیەک بەشدارییت دەکرد؟**

و: من لە بڕیاری سەرکردایەتیدا بەشدار نەبووم، بەڵام وەکوو کادیرێکی یەکێتیی نیشتمانی ملکەچی بڕیارەکانی سەرووی خۆم بووم، چونکە لە حیزبایەتیدا وا فێر کرابووین کە دەبێ خوارەوە ملکەچی بڕیارەکانی سەرەوە بێت.

**پ٤: ئایا ئەو کاتە پێت وابوو کە دەبوو تۆش بە شێوەیەک لە**

**•له حیزبایەتیا وا فێر کرابووین که دەبێ خوارەوە ملکەچی بڕیارەکانی سەرەوە بێ**

**•من پێم وابووە و وا گۆش کرابووم، که هەموو بڕیارەکانی سەرکردایەتی ڕاستن**

**•ئەوەی ئێمە کارمان بۆ کرد ئەوە نەبوو ئەمڕۆ ڕوو دەدات**

**•باوکم پارتی و دایکم کۆمۆنیست بوو**

**•خوێنی ئەم چوار کۆرپەیەی ئێمەتان بە ئەستۆ**

**•مرۆڤ خاکەکەی شەرەف و کەرامەتێتی**



دکتۆر موشیر

کادێری پێشکەوتوو بە پلەی جیاجیا کارم کردووە و لە ساڵی (١٩٧٩)دا لە ناوبژی نێوان حیزبی دیموکراتی کوردستان و حکومەتی ئێراندا لەگەڵ کاک دلێر سەید مەجید چەندین جار سەردانی دەفتەری بەڕێزان ئیمام خومەینی و سەردانی بەڕێز حوسەین نەوەی ئیمام و بەڕێز ئایەتوڵا مونتەزری و خوالێخۆشبوو محمدی مونتەزیری و خوالێخۆشبووان دکتۆر مەهدی بازرگانی سەرۆک وەزیر و دەریوش فروهەری وەزیری کار و چەندین گەورە لێپرسراوی تری ئێرانمان کردووە. نامەی بەڕێز مام جەلالمان بردووە بۆ ناوبژی و ئەنجامی وتووێژی هەبووە لە نێوانی هەردوو لادا. لە ساڵی (١٩٨٦)دا چوار ساڵ وەکو ئەندامی مەکتەبی مەرکەزیی یەکێتیی نیشتمانی لە کۆماری ئیسلامی دانرام و کارم لە تاران بوو. لە ساڵی (١٩٩٠)دا وەکوو پەنابەر هاتمە سوید و خەریکی ژیانی ئاسایی خۆمم و هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەک بەرژەوەندیی نەتەوەکەمی تێدا بێ بەشداری تێدا دەکەم و تاکو کۆتایی ژیانم لە کوردایەتی واز ناهێنم و وازم لە خەبات و تێکۆشان نەهێناوە.

**شێوەکانی ڕاوەرگرتن بەشداربیت؟ ئەگەر "نا" چ هەوڵێکت بۆ ئەم مەبەستە داوە؟**

و: من وەکوو کادێری یەکێتیی نیشتمانی و پێشمەرگەیەک لە شۆڕشی ئەیلوولەوە پێم وابووە و وا گۆش کرابووم، کە هەموو بڕیارەکانی سەرکردایەتی ڕاستن، لە هەردوو پارتیدا واتە: پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، بڕیارەکانی سەرکردایەتیم جێبەجێ کردووە.

**پ٥: ئایا ئەوەی ئەمڕۆ بەرقەرارە ئەوەیە کە تۆ هەوڵت بۆ دەدا؟ لەبەردەمی وەڵامەکەتدا هەست بە چی دەکەیت؟**

و: ئەوەی من و زۆربەی هەڤاڵەکانم و هەڤاڵە شەهیدەکانم کارمان بۆ کرد و ئەوەی ئەمڕۆ ڕوو دەدا ئەوە نەبوو. ئێمە بۆ کوردستانێکی ئازاد و سەرفراز و دیموکرات کارمان دەکرد و خەباتمان دەکرد و بە خوێن و فرمێسک ئەو فیدرالییەمان هێنایە بەرهەم، بەڵام بە دەستی خۆمان ماڵی خۆمان کاول کرد. ئەوەی بە لای منەوە سەیرە ئەوەیە کە جاران دەمانگوت کورد بێکەسە و کەس یارمەتیمان نادا، کەچی بە پێچەوانەوە دونیا بۆمان بەپەرۆشە و خۆمان دەمانەوێ فیدرالییەکە و ئەوەی یەک ملیۆن شەهیدمان لەسەر داوە و خەباتمان بۆ کردووە، لەناوبەرین.

**پ٦: کامانەن ئەو یادگارو ناسۆرانەی ژیانی پێشمەرگایەتیی بەجێی هێشتووە لە دەروونتا؟**

و: چوار ناسۆری زۆر ناخۆش کە سێیان لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا ڕوویان داوە و چوارەمیان لە ژیانی پەنابەریمدا:

١- یەکەم ناسۆر تێکچوونی شۆڕشی پیرۆزی ئەیلوول بوو، کە هەرگیز باوەڕم نەدەکرد، ئەوەی نەدەبوو ڕوو بدا ڕووی دا و شۆڕش کۆتایی هات و منیش بوومە پەنابەر لە ئێران.

٢- لە شۆڕشی ئەمجارەدا لە شەڕی براکوژیدا، لە شەڕی جود و یەکێتیی نیشتمانی کوردستاندا لە ناوچەی نیودەشت و قرناقە و پشتئاشان، چوار برادەری زۆر خۆشەویستم شەهید کران، کە هەر چواریان لە یەک سەنگەردا بوون لە شۆڕشی ئەیلوولدا و دوایی هەر چوار کرا بوون بە دوژمنی یەک و یەکتریان کوشت. ئەمەش ناوەکانیانە: شەهید حەسۆ میرخان ژوکی و براکەی بە ناوی حاجی، سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق. شەهید نازم حەمەی سلێمان و شەهید ئەحمەد مەولوود کە هەردووکیان فەرماندەی تیپی یەکێتیی نیشتمانی بوون.

٣- ناسۆرێکی زۆر ناخۆشتر، لە کاتی کیمیاویبارانی دوڵی بالیان سەرەتای ١٩٨٦ پتر لە حەفتا بریندداریان هێنا بۆ ئورمیە و زۆربەیان ژن و منداڵ بوون. بە ڕێکەوت خێزانێک چوار کوڕ و باوک و دایکەکە بەرکەوتبوون. لە سەرکردایەتییەوە من ئاگادار کرام کە بڕۆم بۆ یارمەتیدانی بریندارەکان. کاتێ کە چووم بەڕێزان کاک سامی عەبدولڕەحمان و کاک فەلەکەدین کاکەیی و کاک ئیبراهیم خدر میران لەوێ بوون و دەست بە کار بوون. ئەو خێزانەی کە چوار کوڕەکەیان بەرکەوتبوون، هەر ڕۆژەی یەکێکیان دەمرد و کفنمان دەکرد و بە سەیارەی کاک طەیب مام غەریب ئاکرەیی تەرمەکەمان هەڵدەگرت و منیان دەنارد و بانگی دایک و باوکیان بکەم بۆ خواحافیزی. کە چوارەم منداڵیان شەهید بوو، دایک و باوکی منداڵەکان خۆیان لەگەڵمان هاتن بۆ ئارامگای شەهیدانی ئوردووگاکە کە پتر لە ٢٥٠ شەهیدی تێدا بە خاک سپێردرابوو. ئێمەش خەڵکی زۆرمان بۆ مەراسیمی بە خاکسپاردنی شەهیدەکان کۆ کردەوە و هەر کەس بە ناوی حیزبی خۆیەوە وتاری پێشکەش کرد و باوک و دایکی شەهیدەکەش قسەیان کرد و ڕوویان لە ئێمە کرد و گوتیان: وا هەر چوار ڕۆڵەکەمان پێشکەش بە خاکی

کوردستان کرد و ڕەنگە خۆشمان بە ڕێگای ئەواندا بڕۆین، بەڵام سوێندتان دەدەین بە خوێنی هەر چوار کورەکانمان کە چیتر شەڕی یەکترکوژی نەکەن و واز لە شەڕی براکوژی بێنن، خوێنی ئەم چوار کوڕەیەی ئێمەتان بە ئەستۆ، ئەگەر ویژدانتان هەیە. بەڕاستی دیمەنێکی زۆر ناخۆش و خەمناک بوو. ئێمەش دڵنیامان کردن کە شەڕی یەکتر ناکەین. ئا ئەمە بوو فیداکاریی خەڵکی کوردستان.

٤- ناسۆری چوارەمیش، من خۆم ٢٣ ساڵ پێشمەرگە بووم، سێ برام و دایکیشم بەشداریی شۆڕشیان کردووە. دایکم ٣ ساڵ بۆ شارۆچکەی گەرمەی سەر بە شاری فەلوجە دوورخرابووەوە و چەندین جار گرتن و مووچەبڕین و ئیهانەکردنیان تووش بووە و بە هاووڵاتی پلە دووی عێراق حساب دەکران. دوای ئەو هەموو ماندووبوونە کە کورد ڕزگاری بوو، دایکم تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بوو و سێ ساڵ بوو داوای دەکردم بگەڕێمەوە، بەڵام لەبەر گرتن لە ڕێگا نەمتوانی سەردانی بکەم، تا لە (١٩٩٨/١٢/٢٥)دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و منیش لە دوورەوڵات بووم. دیارە ئەمە پاداشتی تێکۆشەرانە لە سایەی حکومەتی کوردیدا.

**پ٧: ئێستا کە لە دەرەوەی وڵاتی هەستت چییە بەرامبەر ڕووداوەکانی کوردستان و دەتەوێت بڵێیت چی؟**

و: من لە دەرەوەی وڵات هەست بە زەلیلی و ئاوارەیی دەکەم و ئەگەر ڕۆژگار وای نەکردبایە من پێم وابوو مرۆڤ خاکەکەی شەرەف و کەرامەتێتی. یەک چرکەی ژیان لە کوردستان بە هیچ شتێک ناگۆڕمەوە و کوردستان هێز و گیانمە و تاقەبەردێکی نرخی ژیانمە، بەتایبەتی بۆ مرۆڤێکی وەکوو من کە لە سەرەتای لاوێتییەوە دەستلەملانی چیا سەرکەشەکانی کوردستان بووم و قەت نەمهێشتووە دێهاتە چۆڵکراوەکان بە چۆڵکراوی و بێ پێشمەرگە و پاسەوان بێت و بە بەردەوامی لە ئامێزی کێوە سەرکەشەکانی کوردستاندا بووم. بەڵام ڕۆژگار من و چەک و من و کوردستانی خۆشەویست و من و چیا سەرکەشەکانی لە یەک دوورخستەوە. من ئێستا لە دەرەوەی وڵات هەست دەکەم نەتەوەکەم خەریکە ڕۆژی ڕووناکی لێ تاریک دەبێ و خۆمان بە دەستی خۆمان ماڵی خۆمان ئاگر دەدەین. دوا هاوارم بۆ سەرکردەکان بەڕێزان کاک مەسعوود و مامجەلال ئەوەیە، ئەوی ماوە با ئەویش لە بەین نەچێ و هەوڵ بدەن ئاشتی بەرقەرا بێ و لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە چارەسەری کێشەکان بکەن، چونکە گەل یەکلاکەرەوەیە و هەڵبژاردن تاقە ڕێگای چارەسەرکردنی کێشەکانە، بۆ ئەوەی ئێمەی دوورەوڵاتیش بگەڕێینەوە کوردستانەکەمان و چیتر ئاوارە نەبین.

---

**(پاشماوەی PKK و چەند سەرنجێک)** خەڵکم بینیوە باسی ئەوەیان کردووە کە لەنێو ڕیزەکانی پ.ک.ک دا(گەریلا) کچ و کوڕ بە یەکەوە دەخەون و، (کافرستان)یەکە هەر مەپرسە! هەمووشمان دەزانین پێچەوانەکەی ڕاستە. گەریلای سەر بە پ.ک.ک بە مرۆڤی دڕندە و کێوی و مرۆڤخۆر پیشان دراوە. پ.ک.ک منداڵڕفێنە و دەدزێت و دەکوژێت و نایشارێتەوە. جێگای داخە ڕۆژ تا ئێوارە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی پارتی بەم جۆرە حیکایەتانە سەری خەڵک گێژ دەکەن. با نموونەیەک بێنینەوە: کابرایەک کوڕەکەی بە ئارەزووی دڵی خۆی دەبێتە گەریلا و نایەتەوە. ڕادیۆ یا تەلەفزیۆنێکی پارتی دەچن باوکەکە دێنن و، بە بینەر و گوێگری دەسەلمێنن کە پ.ک.ک منداڵ دەرفێنێت، بێ ئەوەی باسی ئەوە بکەن یا بڵێن کوڕەکە خۆی بڕیاری داوە و نەهاتۆتەوە. زۆربەی زۆری ڕووداوەکانی تایبەت بەم بابەتە سەرپێهاتێکی بەم شێوەیەیان هەیە کە باس کرا. گەنجێکی دەشتێکی هەولێر کە کاتی خۆی هاتوچۆی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی میزۆپۆتامیای لە هەولێر دەکرد، بۆی گێڕامەوە: هەر کە دەچووینە ئەو شوێنە بە هۆی کاسێتی ڤیدیۆ بەرهەمی کولتووری و گۆرانی و هەڵپەڕکێ و گەریلا و دیمەنی هەمەچەشنی باکووری کوردستانمان چاو پێ دەکەوت. ئێمەیان فێری نیشتمانپەروەری و خۆشویستنی کوردستان دەکرد. ئێمە قەت قەت زۆرمان لێ نەدەکرا تا کارێ بکەین خۆمان ڕامان لێ نەبێ.

دەمەوێ ئەوەش بڵێم لە گەشتەکەی ئەم جارەمدا بە چاوی خۆم لاوی کوردم بینیوە کە گوتوویەتی: ئەگەر لەبەر باوکم و ماڵەوەمان نەبێ ئێستا دەچمە ناو پەکەکە(١).

لە سوێدیش دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەو وڵاتە دیارنەبوونی چەند کوڕ و کچێکی کوردیان بە هەڵ قۆستەوە و، وەک هەمیشە کارەکەیان زۆر گەورە کردەوە. تەنانەت دایک و باوکی لاوەکان خۆیان هاتنە سەر تەلەفزیۆن و گوتیشیان: "ڕۆڵەکانی ئێمە بە ئارەزووی خۆیان ئەم کارەیان ئەنجام داوە". یەکێ لە دایکەکان لەسەر کەناڵی (TV4)ی سوێدی گوتی: "کچەکەی من کە دوو مام و خاڵێکی شەهید کراوە خۆی ئازادە لە بڕیاردان". پاشان دەرکەوت کە ئەو کچ و کوڕانە لە ئەورووپا(بروکسل، ئەڵمانیا،..هتد)، سەبارەت بە کورد و کوردستان مەشقیان پێ دەکرێت و فێر دەکرێن. ئێستا کە هەموو گەنجە کوردەکان دیارن و نەڕۆیشتوون بۆ کوردستان، هەنێکیشیان لە Med-tv ئیش دەکەن، هەق نییە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی سوێدی داوای لێبووردن لە کورد بکەن و، ڕاستیی مەسەلەکانیش بە بینەران و گوێگران و خوێنەرانی خۆشیان بگەیەنن. یەکێ لەو کچانەی کە خۆی هاتۆتەوە سوید، وەها دەدوێت: پێشتر بە شێوەیەکی گشتی دەمزانی من کوردم. ئێستا گەلێ شت سەبارەت بە گەلەکەم فێربووم. ئێستا بە شانازییەوە دەڵێم: "دەزانم من کێم"(٢).

دیسان دەبێ بڵێین سێ لەو کچ و کوڕانە(ئەڤین دالابا/١٦ ساڵ، جەنان کارەر /١٨ ساڵ و زەینەب گوجلو /١٦ ساڵ)، دوای گەڕانەوەیان بۆ سوید بە گەورەترین ڕۆژنامەی سوێدییان ڕاگەیاندووە کە ئەوان دەیانەوێ لەسەر خەباتی خۆیان بەردەوام بن لە ڕیزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستاندا(٣).

لە باشوور، لە ئەنجامی شەڕ و پێکدادان لە نێوان پ.ک.ک و پ.د.ک دا، خەڵکی سڤیلیش لەناو دەچن. ئەمە شتێک نییە بشاردرێتەوە. لێ.. بەڵێ شانەکە هەمووی لە سەری (پ.ک.ک)دا دەشکێنرێت. دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەبنە زوڕنالیدەری شەڕی کوردکوژی. کە لە کوردستان بووم لە ناوچەکانی حاجی ئۆمەران و سیدەکان شەڕێک ڕووی دا. لە ئاکامدا دوو سێ کەس کە کاری (سپیکاری)یان دەکرد بەبەر گوللەی ڕێڵ کەوتن و کوژران. تەلەفزیۆنەکانی پارتی و لایەنگرانیان کردیانە هەڵلا کە پ.ک.ک خەڵکێکی بێ گوناهیان کوشتووە. هەڵبەت لەوانەیە تا ئێستاش ئاشکرا نەبووبێ گوللەی چ لایەنێک ئەم دوو سێ کەسە بێ گوناهەی پێکابێ. ئەوەی لای پارتی گرنگ بێ تاوانبارکردنی پ.ک.ک یە و بەس!

**سەرچاوە و پەراوێز:**

(١) لە هەولێر و دەوروبەری زۆر جار بە پ.ک.ک دەڵێن پەکە.

(٢) ڕۆژنامەی سوێدی: Metro, 10-12/1998.

(٣) ڕۆژنامەی سوێدی: Dagens Nyheter, 10-12/1998.

# نووسەرانی کورد
# وەڵامیان چییە بۆ پرسیارە سیاسییەکان

**گۆڤاری کۆنتراکت بە ئەرکی خۆی دەزانێت کە دەربارەی هەندێک رووداوی گرنگی کوردستان، کەپێویستە لە بواری سیاسییدا لێی بکۆڵرێتەوەو گفتوگۆی لەسەر بکرێت، رۆڵی خۆی ببینێت. ئەو رووداوانە بە پلەی یەکەم لەسەر خەڵکی هەژاری کوردستان دەکەوێت و لەسەر حسابی ئێستا و داهاتووی هەموومانە و تەنیا مەسەلەی نێوان هێزە کوردییەکان نییە.**
**ئەوانەی روو دەدەن چین و هەڵوێستاکانمان چی پیشان دەدەن؟ ئەو بارە ناهەموارە سیاسییەی هەیە تا چ رادەیەک دیارە بە نووسران و ناسراوان و خاوەن بروانامەکانەوە. خەڵک چی بکات کاتێک کە کارەساتێکی سیاسی روو دەدات؟**
**میوانی ئەم جارەمان محەمەد رەسوڵ هاواری مێژوونوس و سەباح غالبی سەرنووسەری گۆڤاری باسکارە.**



## محەمەد رەسوڵ هاوار:

## •ئەدانی پەناگایەک بە پ.ک.ک بڕیاری تورک و ئەمریکایە
## •جلخوارەکان ناوی کوردیان سووک کرد
## •رۆژێکی یەکجار رەشە کورد و رۆشنبیرانی ئا بەم شێوەیە بەرانبەر بە دوژمنایەتیکردنی شۆڕشی باکوور بێدەنگ بن
## •مێژوو بەزەیی بە کەسدا نایە ئەگەر پاشگەز نەبنەوە و نەیەنەوە سەر ڕێبازی راست

**- رۆژی ١٩٩٦/٨/٣١، پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ک) بۆ گرتنەوەی هەولێر پێش سوپای عێراقی کەوت و ئاڵای عێراقییان لە سەر خانووی پەرلەمانی کوردستان هەڵ کرد. دیسان لە رۆژی(١٩٩٨/٥/١٤)یشدا، سوپای تورکیا بە پاڵپشتی (پ.د.ک) تا هەولێر هات.**
**- لە ناوچەی ژێر دەسەلاتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (ی.ن.ک)یشدا هێزی ئێران بۆ کوشتنی کوردی رۆژهەلات تا کۆیە هات. تا ئێستا ژمارەیەکی زۆر بە دەستی رژێمی ئێران لەم ناوچەیەدا تیرۆر کراون.**

**پرسیار: ئەم رووداوانە بەلای ئێوەوە چین (خیانەت، هەڵە، نیشتیمانپەروەریی،..)؟ قسەتان چییە بۆ وەڵامەکانتان؟**

وەڵام: دەربارەی رۆژی ١٩٩٦/٨/٣١ کە سوپای عێراق هێنرا بۆ داگیرکردنی هەولێر، لە کاتی خۆیدا لە کۆبوونەوەیەک لە لەندەن و لە گۆڤاری (هەتاو)دا شیعرێکم بە ناوی "وەفدی کوردستان، تێهەڵکێش بۆ شیعرە بەرزەکەی پیرەمێردی نەمر بڵاو کردەوە و لە ئەنجامی ئەو شیعرە و پێشەکییەکەیدا کاسەلێسەکانی ئیبراهیم خەلیل لە جاشخانەیەکیاندا بەیانێکی دووروودرێژی پڕ لە جنێو و درۆیان دەربارەم بڵاو کردەوە. لای زۆربەی خەڵک ئەو جۆرە بڵاوکراوانە لە سەرەنوێلکەکانیشدا جێگەیان نابێتەوە و ناتوانن تاقە وشەیەک یا دێڕێک بسڕنەوە، کە دەربارەی ئەو تاوانە لە لایەن چەند رۆشنبیرێکی ئازا و بەجەرگەوە، بۆ نموونە دوکتۆر جەمال نەبەز و سەبری بۆتانیی کۆچکردوو و دوکتۆر کەمال میراودەلی و گەلێ کەسی ترەوە، بێ سڵکردنەوە داخی دەروونی خۆیان بەرانبەر رشت.

دەربارەی هێنانی سوپای تورک لە رۆژی (١٩٩٨/٥/١٤)دا شتێکی تازە نەبوو. بەرلەوە بەئاشکرا هاواریان دەکرد و دەیانووت: "بیست هەزار جاشی چەکدار مانگی بە ٣٠ ملیۆن دۆلار.... کە ئەمە لە زۆر گۆڤار و رۆژنامە و بڵاوکراوەدا ئاشکرا کراوە و ناتوانرێ بە درۆ بخرێتەوە...

لەراستیدا لایەنگرێتیی جلخوارەکان بۆ نەوەی مەغۆل و جەنگیزخان وەکوو جۆرە کاسبییەکی لێ هاتووە و وەکوو تاقمەکەی (انطوان لحد)ی سەر سنووری ئیسرائیل و لوبنان. ئەو جلخوارانە ناوی کوردیان زڕاندووە و لام وایە مێژوو زۆر دڵڕەقە و بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە ئەگەر پاشگەز نەبنەوە و نەیەنەوە سەر ڕێبازی کوردایەتیی راستی دوور لە ناوچەگەرێتی، رۆژێک دێ لە لایەن ئەوانەشەوە کە بە کرێ گیراون بە چاوێکی سووکەوە سەیر دەکرێن، چونکە داگیرکەر بەئاشکرا لە دڵی خۆیدا دەڵێ: "ئەوی وەفای بۆ وڵات و میللەتەکەی خۆی نەبێ، چۆن وەفای بۆ من دەبێ!؟"

دەربارەی هێنانی سوپای ئێران هەتا ناوچەی کۆیە، هەڵەیەکی زۆر گەورە بووە، ئەگەرچی کاک عومەر شێخمووس پاکانەی بۆ کردووە گوایا برادەرانی کوردی ئێران پێشەکی ئاگادار کرابوون، وەکوو لە ژمارەی (٣)ی گۆڤارەکەتانا باسی کردووە.

کابرایەکی سیاسیی ناسراوی ئەمریکایی، بەداخەوە ناوەکەیم لە بیر چووەتەوە، بەراووردی هێنانی سوپای عێراق و ئێرانی بەم جۆرە کردووە: "هێنانی سوپای عێراق بۆ داگیرکردنی هەولێر کەتنێکی ستراتیژی بووە و خەڵکێکی زۆری تێدا کوژراوە، ئەوەی سوپای ئێرانیش کەتنێکی تاکتیکی بێسەروبەر و زیانبەخش بووە."

هەرچەندم کرد دەربارەی ئەوە لەو بۆچوونەی ئەو کابرایە زیاترم بە خەیاڵدا نەهات.

**ڕۆژی ١٩٩٨/٩/١٧، سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی: جەلال تاڵەبانی و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان: مەسعود بارزانی، لە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە واشنتۆن، بە شایەتیی نوێنەری ئەمەریکیی داڤید ویلچ (c. David Welch)، بەیانی کۆتایی ڕێکەوتنیان مۆر کرد. لەم بەیانەدا تاڵەبانی و بارزانی دەڵێن:**

**١- ئێمە دووپاتی یەکێتی خاکی عێراق دەکەینەوە. ئەو سێ پارێزگایەی "شیمال" دهۆک، ئەربیل و سلێمانی بەشێکن لە وڵاتی عێراق.**

**پرسیار: ئایا بە رای تۆ ئەم دووپاتکردنەوەیەو، کوردستاندانانە بە بەشێک لە وڵاتی عێراق، سەرچاوە لە ویست و بەرژەوەندی کێوە وەر دەگرێت؟ گەلی کورد یان بێگانە؟ قسەت چییە بۆ وەڵامەکەت؟**

وەڵام: دەربارەی قسەکانی کاک مەسعوود و مام جەلال، دەربارەی ئەوەی پارێزگاکانی دهۆک و هەولێر و سلێمانی بەشێکن لە وڵاتی عێراق، شتێکی ناڕەوایە و مانای نەبوونی ئیمانە بە یەکپارچەیی کوردستان و لام وایە هیچیان مافی ئەوەیان نییە بە ناوی هەموو میللەتی کوردەوە جارێک بیکەن بە بەشێک لە عێراق و جارێکی تریش بیر لەوە بکەنەوە بە هەر ناوێکەوە بێ بخرێنە سەر تورکیا. ئەگەر کەس تورکی نەناسیبێ، ئەوا لاپەڕەکانی مێژووی باکووری کوردستان شاهیدی ئەو هەزاران شەهید و ماڵکاولییەن کە کورد بە هۆی تورکەوە بەسەری هاتووە و ئەوانە نەوەی گورگن و فارسناسایی: "عاقبت گورگ زاد گورگ شود، گرچی با ئادمیی بزرگ شود".

هەموو ڕووداوە مێژووییەکان ئەوەیان ئاشکرا کردووە، کە کلیلی سەرکەوتنی بزووتنەوەی کورد بریتیە لە سەرکەوتنی ڕاپەڕین و شۆڕشی باکووری کوردستان. تورک لە قبرسدا لە ملیۆنێک کەمتر تورکی هەیە و ٣٠ هەزار سەربازی بۆ پاراستنی ئەو تورکانە داناوە و حکومەتی بۆ دروست کردوون، بەڵام ١٥ تا ٢٠ ملیۆن کورد بە هیچ نازانێ و هەموو کوردێک بە تیرۆریست دەژمێرێ.

**٢- هەردوو حیزبەکە بە یارمەتی "لیژنەی هاوکاریی باڵا"(#) هیچ پەناگەیەک لە کوردستانی عێراقدا نادەن بە حیزبی کرێکارانی کوردستان (پ.ک.ک). هەروەها زامنی ئەوە دەکەن کە پ.ک.ک، هیچ بنکەیەکی لە ناوچەکەدا نەبێت. قەدەغەی دەکەن پ.ک.ک ئاسایش لە ناوچەکەدا تێک بدات، ئاشتی تەقویز بکات و سنووری تورکیا ببەزێنێت.**

**پرسیار: ڕۆژی ١١/١٢ عەبدوڵا ئۆجەلان، سەرۆکی پ.ک.ک لە فڕۆکەخانەی ئیتالیا گیرا. حکومەتی تورکیی داوای تەسلیمکردنەوەی ئۆجەلان وەکو تیرۆریست دەکات. هەروەها تورکی شۆڤێنیی و خراپ لە ناوەوە لە دەرەوەی وڵات بە خۆپیشاندان پشتگیریی لە حکومەتی تورکیی دەکەن. ئایا ئەم دیمەنەت چۆن دێتە بەرچاو کە ئەو دوو حیزبە کوردییەو حکومەتی تورکیی و تورکی خراپی پێچەوانەی کەسانی وەکو ئیسماعیل بێشکچی لە بەرەیەکدا یەک دەگرنەوە؟**

وەڵام: نەدانی هیچ پەناگایەک بە پ.ک.ک. بەئاشکرا، بریتیە لە بڕیارێکی تورک و ئەمریکا و بە ئاگاداریی ئیسرائیل و لام وایە میللەتی کورد بەتێکڕایی خۆی خاوەنی ئەو دەسەڵاتیە پەناگایەک بدرێ بە کوردی ناوچەیەکی تر و تەنیا هەر ئەوانەی باوەڕیان بە یەکپارچەیی کوردستان نییە، خۆیان لە قوڕی ناوچەگەریدا چەقاندووە.

هاتنی ئاپۆ، عەبدوڵڵا ئۆجەلان، بۆ ماوەیەک بۆ ئیتالیا و بۆ شوێنێکی تری نەزانراو هەتا ئێستە کێشەی کوردی لە کێشەیەکی ناوچەییەوە گواستۆتەوە بۆ کێشەیەکی نێودەوڵەتان و سەرنەگرتنی داخوازییەکانی تورک بە ناردنەوەی بۆ تورکیا، کارێکی وای کردووە، کە تورک سەری بدا لە بەرد و ناماقووڵیی بۆ مایەوە و ئەو کێشەیەی لەگەڵ ئیتالیادا بەرپای کرد ئەوەندەی تر وڵاتانی ئەورووپای وا لێکرد ڕێگە نەدەن بۆ تورک بچێتە ناو بازاڕی یەکگرتووی ئەورووپاوە، کە شەو و ڕۆژ خەوی پێوە دەبینێ.

سەیر و سەمەرە ئەوە بوو، ساتێک ئۆجەلان سوریای بەجێهێشت، جلخوارەکانی لای خۆمان مژدەی خۆشی و شادییان بە یەکتر دەگەیاند و لایان وا بوو ئەوانیش تووشی ئاشبەتاڵ بوون و لەوە نەگەیشتوون کە شۆڕشی باکوور شۆڕشێکی جەماوەریی چەوساوەکانی باکووری کوردستانە و شۆڕشێکی عەشایەری نییە و بە ئەمری تاقەکەسێک یا بە نەمانی تاقەکەسێک ئاشبەتاڵی لێ بکرێ.

با ئەوانەی مێشکیان شۆراوەتەوە و سەفتەی دۆلاری قەندەنشکاو و کوردایەتیی پاک و بێگەردی لە بیر بردوونەتەوە، گوێ لەم دوو دێرە شیعرەی پیرەمێرد بگرن:

تا خاکەکەمان بە خوێن نەشۆرێ
ئیمان بە سکەی ڕووپیە نەگۆڕێ
تەشەبوساتی من تەواو نابێ
موتڵەق ئەم ئیشە هەر ئەبێ وابێ

بەڕاستی ڕۆژێکی یەکجار شووم و ڕەشە کە کورد و ڕۆشنبیرانی کورد ئا بەم شێوەیە بەرانبەر بە تاوانی دوژمنایەتیکردنی شۆڕشی باکوور بێدەنگ بن.

**٣- هەردوو پارتەکە ئیدانەی شەڕی ناخۆ دەکەن و پەیمانی ئەوە دەدەن کە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانیان، پەنا نەبەن بۆ بەکارهێنانی زەبر یان هەر یەکەیان دژی ئەوی تریان داوای هێزی دەرەوە نەکات.**

**پ: قسەت چییە لەسەر ئەو دێرانەی سەرەوە؟**

وەڵام: دەربارەی ئەم پرسیارە و ئەو باسە گرنگانەی لە هەر سێ ژمارەکەدا بڵاو کراونەتەوە، هەموویان بریتین لە وەڵامێکی دوورودرێژ بۆ پرسیارێکی گرنگ کە بریتییە لە: ئایا گێرە و کێشەی و گیروگرفتی بیروباوەڕ لە ناو کۆمەڵگاکانی کورددا لە چ گێژاوێکدایە و ئەمانە هەموویان میللەتی کورد بەرەو کوێ دەبەن؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کۆنفرانسێکی فراوانی چەند ڕۆژە لەناو وڵاتدا، بەبێ کارتێکردنی حزبەکان، یا لە دەرەوەی وڵات پێک بێت و هەروەکوو میللەتە خراپێداوەکان هەموو کێشە و گیروگرفتەکان شی بکرێنەوە و لێیان بکۆڵرێتەوە و ڕێگە بۆ ئەوە خۆش بکرێ ئامۆژگایەکی ستراتیژی کورد پێک بێ، بۆ ئەوەی نەخشەیەکی زانیارییانە بۆ بزووتنەوەی ئەم میللەتە کڵۆڵە دەستنیشان بکرێ!؟

## سەباح غالب:

**•بە باوەڕی من پرسیارەکە نابێ وا بکرێ پارتی و یەکێتی بخرێنە خانەی تورکیای داگیرکەرەوە**
**•شەڕی کورد و کورد وای کردووە داگیرکەرەکانمان بە تورکیاشەوە کەڵک لە پشێویی پەیوەندییان وەربگرن**
**•خودا بکا کارەساتەکان زۆری فێر کردبن و لەوە بە دوا کاری خێر بکەن**
**•دەبێ ئەو هەموو کوژراوانە لە پێی چی بووبن!**



سەباح غالب

**ڕۆژی ١٩٩٦/٨/٣١، پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ک) بۆ گرتنەوەی هەولێر پێش سوپای عێراقی کەوت و ئاڵای عێراقییان لە سەر خانووی پەرلەمانی کوردستان هەڵ کرد. دیسان لە ڕۆژی(١٩٩٨/٥/١٤)یشدا، سوپای تورکیا بە پاڵپشتی (پ.د.ک) تا هەولێر هات.**

**- لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (ی.ن.ک)یشدا هێزی ئێران بۆ کوشتنی کوردی ڕۆژهەڵات تا کۆیە هات. تا ئێستا ژمارەیەکی زۆر بە دەستی ڕژێمی ئێران لەم ناوچەیەدا تیرۆر کراون.**

**پرسیار: ئەم ڕووداوانە بەلای ئێوەوە چین (خیانەت، هەڵە، نیشتیمانپەروەریی،..)؟ قسەتان چییە بۆ وەڵامەکانتان؟**

وەڵام: ڕاستەوخۆ پێوەندی بە قەیرانی سیستەمی عەقڵ و سیاسەتی هەر هەموو هێزە سیاسییە چەکدارەکانی کوردەوە هەیە، هەندێک لە زەقترین خاڵی ئەو قەیرانە بریتین لە:

١ـ نەبوونی عەقڵی کۆمەڵایەتی و پێکەوەهەڵکردن، دانەدواوەی کەسان و لایەنی دووەم و هەڕەشە و گوڕەشەی لەبەینبردنی یەکدی، کارێک بە سیاسەتمەداری چەکدار دەکا کە نەتوانێ بە شەرعیەتی دەنگدان و ڕێزی بیروباوەڕی جیاوازبوونی خۆی بسەلمێنێ. چەک دەبێتە سەرپشک و پێش عەقڵ دەکەوێ، ئیدی بۆ چەککۆکردنەوە و خۆسەپاندن، کوردی خاوەن چەک، سەر بە کشت ماڵە دوژمنێکدا دەکا و شەڕی کورد ـ کورد لە مەترسیترین شێوەدا خۆ دەنوێنێ.

٢ـ بێبەهایی مرۆڤی کورد و ژیانیان. بە درێژایی دوو سێ ساڵ خەڵکیان بە کوشت دا، بێ ئەوەی لە ڕێککەوتنیاندا کەم و زۆر هێمای بۆ بکەن و داوای لێبووردن لە گیانی مردووان و کەسوکار و میللەت بکەن. ئەمە لە سەختترین جۆری ناقۆڵایی و هەست بە لێنەپرسینەوەدا دەردەکەوێ.

٣ـ نەبوونی بەرنامەی کارگێڕێتیی ئێستا و بەتەنگەوەنەهاتنی دواڕۆژی نەتەوە. لەگەڵ ئەوانەشدا نەبوونی ستراتیژیەت و خەتی سوور کە بەسەریدا باز نەدەن و لێی دەرنەچن.

خاڵی دیکەش زۆرن بۆ خولقاندنی باری نالەبار و ڕووداوی چەوت و نەشیاوی سیاسەت. بە لای منەوە، تاوانی گەورە لە شەڕی کورد ـ کوردەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ و هیچ تاوانێک لەو تاوانە قورستر و دژوارتر نییە.

تازە دوای سی چل ساڵ، قارەمانەکانی شەڕی کوردکوژی لە ڕێککەوتنەکەی (٩٨/٩/١٧)ی واشنتۆندا دان بە تاوانی ئەو شەڕەدا دەنێن! دەبێ ئەو هەموو کوژراوانە لە پێی چی بووبن! پێدەچێ پیالە بووبن یان لێوانی لە گڵ دروستکراو، کەیبانووی خوێنتاڵ و ناحەز بە خۆشی و ئاشتی ماڵ و حاڵ لە دەستی بەربووبنەوە و شکاندبنی. من پێم وایە سنووردانان بۆ شەڕی کوردکوژی، سنووریش بۆ تاوانی هاوکاری لەگەڵ دوژمناندا دادەنێ. یەکێک لەو ڕاستییانە کە دەکرێ هەمیشە لە بیر و بەرنامە و ویژدانی سیاسەتمەدارانی کورددا زیندوو بێ ئەوەیە کە وڵاتانی داگیرکەری کوردستان لەگەڵ هەموو دوژمنایەتییەکی مێژوویی و جوگرافیایی و ئایدیۆلۆژی و مەزهەبییان لەسەر لێدانی کورد و داگیرکردنی و چەوساندنەوەی ڕێکن.

لە ماوەی سالانی ١٩٩٢، ١٩٩٣ و سەرەتای (١٩٩٤)دا، وەزیرانی دەرەوەی ئێران، سوریا و تورکیا زۆرترین کات و کۆششیان بۆ دەلاقەخستنە نێوان هێزە سیاسییە چەکدارەکانی کورد تەرخان کردبوو. ئەمانیش ئامادەیی لاوازییان تێدا بوو، لەبەرئەوە لەسەر دەستی کورد خۆی داگیرکردنەوە و غەزوی کوردستان کرایەوە!

**ڕۆژی ١٩٩٨/٩/١٧، سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی (جەلال تاڵەبانی) و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان (مەسعود بارزانی) لە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە واشنتۆن، بە شایەتیی نوێنەری ئەمەریکیی داڤید ویلچ (c. David Welch)، بەیانی کۆتایی ڕێککەوتنیان مۆر کرد. لەم بەیانەدا تاڵەبانی و بارزانی دەڵێن:**

**١- ئێمە دوپاتی یەکێتی خاکی عێراق دەکەینەوە. ئەو سێ پارێزگایەی "شیمال" دهۆک، ئەربیل و سلێمانی بەشێکن لە وڵاتی عێراق.**

**پرسیار: ئایا بە رای تۆ ئەم دوپاتکردنەوەیەو کوردستان دانانە بە بەشێک لە وڵاتی عێراق، سەرچاوە لە ویست و بەرژەوەندی کێوە وەر دەگرێت، گەلی کورد یان بێگانە؟ قسەت چییە بۆ وەڵامەکەت؟**

وەڵام: لە خوێندنەوەی پرۆگرامی یەکێتی و پارتی و یاسای پەرلەمان و سەرجەم حکومەتەکانی خوارووی کوردستان

بەراشکاوی دەردەکەوێ کە سەربەخۆیی بۆ کوردستان یان بەشێک لە کوردستان لە بەرنامەیاندا نییە. ئەو دۆخەی دوای جەنگی ئازادکردنی کوێت لە دەست عێراقی داگیرکەر، بۆ خوارووی کوردستان هاتە گۆڕێ، دەکرا پێشتر بخرێ و "ناوچەی ئارام" تەواوی بەشە داگیرکراوەکە بگرێتەوە. بە پشتیوانی بڕگەی مافی چارەنووسی میللەتانی کۆمەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکان و مرۆڤدۆستانی جیهان بکرێتە ئەمری واقیع و چەسپاو. کەچی سەرگەرمی یەکدی لەنێوبردن هیچی بۆ نەهێشتوونەتەوە دارێک بخەنە سەر بەردێک. لەبەرئەوە ئاساییە بۆ ئەوان خوارووی کوردستان بە بەشێک لە عێراق بزانن. هەڵبەت ئەوە لە بەرژەوەندیی عێراقی داگیرکەر و تێکڕا داگیرکەرەکانمانە. ئەوان لەو شوێنانەش کە دەکرێ لە ژێردەستەیی عێراقی داگیرکەر خۆ هەڵبوێرن، خۆ ناپارێزن! هەستی ساکاری کورد، پێی خۆشە کوردستان سەربەخۆ و یەککگرتوو بێ، لەوانەیە خەڵکانی سەر بە هێزە سیاسییە چەکدارەکانیش دژ بە سەربەخۆیی نەبن. لێرەدا، دەبێ پرسیاری ئەوە بکرێ، ئایا سەربەخۆبوونی کوردستان هەر وا هاسان و سادەیە بە ویژدان و هەڵچوون و هەستی خاوێن ئەنجام بدرێ؟ لە وەڵامی ئەوەدا دەڵێم: ئەوی ڕاستی بێ لەئێستادا کورد وەکوو نەتەوە، نیاز و ڕێکخستن و بەرنامە و کەرەسەی وای نییە بتوانێ خۆی لە قەرەی ئەو ئاواتە هەرە پیرۆزە بدا. ناکاریشم کتێب بۆ دوارۆژ بگرمەوە، کە ئاخۆ کەی دەتوانرێ سەربەخۆیی بێتە دی!

چاوەڕوانی عەقڵ و ویست و ڕێکخستن و کەرەسە و لێهاتوویی مەردانی کورد دەکەم. زووتر چێتر و جوامێرانەتر. دیارە لە پێش هەر شتێکدا پێویستمان بە مرۆڤی ئازاد و ئازا و کارامە هەیە.

**٢. هەردوو حیزبەکە بە پارمەتی "لیژنەی هاوکاریی باڵا"(#) هیچ پەنگەیەک لە کوردستانی عێراقدا نادەن بە حیزبی کرێکارانی کوردستان (پ.ک.ک). هەروەها زامنی ئەوە دەکەن کە پ.ک.ک هیچ بنکەیەکی لە ناوچەکەدا نەبێت. قەدەغەی دەکەن پ.ک.ک ئاسایش لە ناوچەکەدا تێک بدات، ئاشتی تەقویز بکات و سنووری تورکیا بشکێنێت.**

**پرسیار: ڕۆژی ١١/١٢ عەبدوڵا ئۆجەلان، سەرۆکی پ.ک.ک لە فرۆکەخانەی ئیتالیا گیرا. حکومەتی تورکیی داوای تەسلیمکردنەوەی ئۆجەلان وەکو تیرۆریست دەکات. هەزارەها تورکی شۆڤێنیی و خراپ لە ناوەوە لە دەرەوەی وڵات بە خۆپیشاندان پشتگیریی لە حکومەتی تورکیی دەکەن. ئایا ئەم دیمەنەت چۆن دێتە بەرچاو کە ئەو دوو حیزبە کوردییەو حکومەتی تورکیی و تورکی خراپی پێچەوانەی کەسانی وەکو ئیسماعیل بێشکچی لە بەرەیەکدا یەک دەگرنەوە؟**

وەڵام: بە باوەڕی من پرسیارەکە نابێ بەو شێوە بکرێ، کە پارتی و یەکێتی بخرێنە خانەی تورکیای داگیرکەرەوە!

لاوازیی سیستەمی عەقڵ و سیاسەتی کورد و شەڕی کورد ـ کورد وایکردووە داگیرکەرانمان بە تورکیاشەوە کەڵک لە پشێویی پێوەندییان وەربگرن.

تێگەیشتنی واقیع و دۆخی کورد ئەوە دەردەخەن کە کوردستان کۆلۆنییەکی چواربەشە. دەوڵەتە داگیرکەرەکان لە جۆری خراپترین و ڕەگەزپەرستترینن. بەپێی باری هەر دەوڵەتە و خەباتی هەر پارچەیە و سیاسەتی نێوچەکە و سیاسەتی نێودەوڵەتی، هەر بەشە جۆرە سیاسەتێک و شێوە لێکدانەوەیەک هەڵدەگرێ.

دروستکردنی "نێوچەی ئارام" لە خوارووی کوردستاندا و کشانەوەی دەوڵەتی عێراقی داگیرکەر و هاتنەکایەی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەت، هەلی مەزن بوو بۆ تەواوی کورد کە لەو بەشدا نیوەسەربەخۆییەک بە دەست بێ و گەشەتریش بکا.

بۆ پاراستنی ئەو دەسکەوتە و بۆ سەرجەم ئاسایشی نەتەوەیی کورد، ئەوە دەخوازرا و دەخوازرێ کە تێکڕا هێزە سیاسییەکانی کورد لە کوردستاندا، تایبەت پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، هێزە ئیسلامییەکانی کوردستان، پارتی کرێکارانی کوردستان و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هاوکار و لە ئاستی قۆناغەکدا بوونایە تا باشتر تاقیکردنەوەی کارگێڕێتیی کوردیان بۆ پێشەوە ببردایە. کەس کارێکی وای نەکردایە بیانوو بۆ داگیرکەران دروست بکا هێرش بکەن و دەستوەردەنە کاروباری خوارووی کوردستان و دەستکەوتە مەزنەکەی لە پەین بەرن.

ئەلفوبێی ستراتیژیەتی کورد و ئاسایشی نەتەوەیی، هاوکاری و دۆستایەتیی کۆڕ و کۆمەڵ و ڕێکخستنە کوردییەکان دەخوازێ. لای من ئاشکرایە، هیچیان بە تەنێ، ناتوانێ کارێکی گەورەی خزمەت بە کورد بکا بێ هەرەوەزی عەقڵەکان و وزەکانی کورد.

لای بابایەکی ساکاری من ئاسایی، کوردستان بەماڵی کورد دەزانم و هەمووومان خاوەنماڵین، دەبێ هەمووشمان هاوبەشی پاراستن و بەڕێوەبردن و پێشکەوتنی بکەین ئەمەش بەوە نابێ گیانی کوردستانیبوونەکە وا لە خۆبایمان بکا، بێ تێخوێندنەوەی هەل و مەرجی خۆیەتی و بابەتی هەر بەشە، کێ ئازا بێ دوو تەقە لەمدیو سنووری دەستکرد بۆ ئەودیو سنووری دەستکرد بکا!

**٣. هەردوو پارتەکە ئیدانەی شەڕی ناخۆ دەکەن و پەیمانی ئەوە دەدەن کە بۆ جێبەجێکردنی ناکۆکییەکانیان، پەنا نەبەن بۆ بەکارهێنانی زەبر یان هەر یەکەیان دژی ئەوی تریان داوای هێزی دەرەوە نەکات.**

**پرسیار: قسەت چییە لەسەر ئەو دێڕانەی سەرەوە؟**

وەڵام: کە قەناعەتت هەبوو بەوەی تاوانت کردووە و ددانی پێدا بنێی، بەشێکە لە تێگەیشتن. ئەگەر بەڵێنت دا جارێکی دی نەیکەیتەوە، بەشێکی دیکەی تێگەیشتنە. ئەگەر خۆت دا بە دەستەوە بۆ دادگاییکردن ئەوا ئەوپەڕی تێگەیشتنە.

ئیدانەکردنی شەڕی کوردکوژی سوننەتێکی تازەی سیاسەتمەدارانی چەکداری کوردە. وەکوو بەڵێنیان داوە ڕوو نەداتەوە و داوەتی داگیرکەران نەکەنەوە بۆ یەکالاکردنەوەی جیاوازییەکانیان، تێڕوانینێکی واقیعیانە و عاقڵانەیە. خودا بکا کارەساتەکان زۆری فێر کردبن و لەوە بە دوا کاری خێر بکەن. ڕۆژانیش ڕۆژی لەدوایە و ناتوانم لە پێش ڕووداوەکانەوە ڕەشبین بم.

پەراوێز:
(#) لیژنەی هاوکاریی باڵا: لە بەیانەکەدا ئاوا ناوی ئەم لیژنەیە هاتووە: ئێمە هەردووکمان ڕێک کەوتوین لەسەر دانانی لیژنەی هاوکاریی باڵا (لجنە التنسيق العليا). هەروەها دەڵێت: بڕیارەکانی لیژنەی هاوکاریی باڵا بە ڕێکەوتنی بەکۆمەڵیی ئەندامەکانی دەبێت.

## نامەیەک لە وەزیری دادی حکومەتی ناوچەی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی دادی ئیتالیا دەربارەی PKK:

ناوچەی کوردستانی عێراق
مەکتەبی وەزیران
وەزارەتی داد
هەولێر، کوردستانی عێراق
١٩٩٨/١٢/١١
بۆ:
حکومەتی ئیتالیا
وەزارەتی داد
رۆم ئیتالیا
بابەت:
نامەیەکی رەسمی دەربارەی دەستێوەردانی تیرۆریستانەی PKK لە کاروباری ناوچەی کوردستانی عێراق لەم دوانزە مانگەی دواییدا.

بەرێز جەنابی وەزیر،
بەخۆشحاڵییەوە سڵاوی گەرمی حکومەتی ناوچەی کوردستانی عێراق و خۆم بۆ ئێوەی بەرێز دەنێرم و ئەم نامە رەسمییەتان لە بری حکومەتەکەم بۆ دەنێرم کە دەربارەی لایەنێکی گرنگە لە ئازارچێشتنی خەڵکی کوردستانی عێراق.
شتێکی ئاشکرایە کە PKK لە ساڵی (١٩٩١)ەوە هەوڵی داوە کوردستانی عێراق بکات بە بنکەی چالاکییەکانی و وەک حاکمێک خۆی بسەلمێنێت بەسەر وڵاتەکەدا، کە ئەمەش دژ بە یاسای نێونەتەوەیی و یاسای وڵاتەکەمان و خواستی خەڵکی ناوچەکەیە.
PKK بۆئەوەی بەو ئامانجانەی بگات پەنای بردۆتە بەر هەموو جۆرە رێگایەک. چالاکیە سەربازییەکانی PKK لەم دیوی سنوور و ئەو وێرانکارییەش کە لە لایەن کەرتەکانیەوە ئەنجام دراوە، بۆتە هۆی بەزۆرهاتنەژوورەوەی چەندجارەی هێزی سوپای تورکیی. کارو چالاکییەکانی PKK لە کوردستانی عێراقدا سیمایەکی تیرۆریستانەی هەیە.
پاشکۆی ئەم نامەیە لیستەیەک لە نموونەی ئەم چالاکییانەی تێدایە کە پیشانی دەدا لە ماوەی ئیمساڵ و ساڵی رابورددوودا PKK و هێزەکانی چییان کردووە.
ئەم چالاکیی و کارانە بەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوەدا بەش دەبن:
١- وێرانکردنی شوێنی گشتی. (پاشکۆی ١)
٢- فڕاندن، کوشتن، بریندارکردنی خەڵکی مەدەنی و شکاندن و خراپکردنی شتومەکیان. (پاشکۆی٢)
٣- فڕاندنی لاوان. (پاشکۆی٣)
٤- رێگرتن لە جێبەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦)ی (نەوت بۆ خواردن)ی UNSC، کە دەماری ژیانی خەڵکی ناوچەی کوردستانی عێراقە. (پاشکۆی ٤)
٥- تاڵانکردن و رووتکردنەوەی گوندەکان. (پاشکۆی٥)
٦- میندانان لە رێگا گشتییەکان، کێڵگەکان و کانی و بیرەکان. (پاشکۆی٦)
خەڵک و بەڕێوەبەرایەتی ناوچەی کوردستانی عێراق و چاودێرانی دەرەوەش کە لە شوێنی خۆیدا لە بار و دۆخەکە کۆڵیونەتەوە، ئەو کارانەی کە لە سەرەوە بە ژمارە ریز کراون، بە تاوانی بێشەرمانەی تیرۆریستی لە قەڵەم دەدەن، کە بە شێوەیەکی سیستەماتیکی دژ بە خەڵکی مەدەنی کراون. ئەم کارانە بە فەرمانی سەرۆکی PKK، عەبدوڵا ئۆجەلان، کە ئێستا دەستبەسەرە لە ئیتالیا، جێبەجێ کراون.
بۆیە ئێمە لەو بڕوایەداین کە بۆ هەقی ئەو خەڵکە بێگوناهانە پێویستە ئۆجەلان لە لایەن دادگایەکی گونجاوەوە دادگایی بکرێت. ئەم چالاکییە بەردەوامانەی PKK لە وڵاتەکەماندا، رێ لەو هەوڵە نیازپاکانە دەگرێت کە دەدرێن بۆ بەرپاکردنی ئاشتی لە کوردستانی عێراقدا و رەنگە هەرەشەش لە ئاشتی و ئاسایشی جیهان بکات ئەگەر سنووریان بۆ دانەنرێت. خەڵک و بەڕێوەبەرایەتی ناوچەی کوردستانی عێراق چاوەڕێی ئەوە دەکات کە حکومەتی ئیتالیا و ئەڵمانیا پشتگیریی لە داد بکەن و یاسا لەم مەسەلەیەدا پیادە بکەن.
هەروەها خەڵکیی هیوادارن زۆر لە ئۆجەلان و پارتەکەی بکرێت کە واز لە کاری تیرۆر لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستانی عێراق بهێنن و دەست نەخەنە کاروباری کوردستانی عێراقەوە، بەوەی هێزەکانیان لەوێ لابدەن.
لێرەدا پێویستە دووبارە پێ لەسەر ئەوە دابگیرێت کە تیرۆریزم و کاری تاوانکاریی رێکخراوێکی کوردی دەبێت لەو هەوڵ و تەقەلایانە جیا بکرێتەوە کە مافی رەوای میللی و دیموکراتیانەی خەڵکی کورد دەپارێزێت. ئەو خەڵکە کوردەی کە شایەنی هەوڵ و تەقەلای پاکی حکومەتە دیموکراتیەکان و خەڵکی نیاز پاکە.
لەگەڵ رێزدا
قادر جەباری
وەزیری داد
پاشکۆی ١-٦
کۆپی بۆ: وەزیرانی دادی وڵاتانی یەکێتی ئەورووپی

---

**تێبینی:**
**گۆڤاری کۆنتراکت ئەو نامەیەی سەرەوەی لە ئینگلیزییەوە کردووە بە کوردی**

# هەواڵەکان چی دەگەیەنن؟



بولینت ئەجەڤیت



عەبدوڵا ئۆجەلان



حافز ئەسەد

**ناله حەفید**
١٩٩٩/٦/٤

گۆڤاری تێمپوسی (Tempus) سویدیی دەنووسێت: *دوای جەنگی جیهانیی یەکەم، کاتێ دەوڵەتی عوسمانیی لەت کرا، کورد لە پەیمانی سیڤەردا گفتی سەربەخۆیی پێ درا. بەڵام سەرکردەی تورکیی، مستەفا کەمال ئەتاتورک، دانی بەم پەیمانەدا نەنا و توانی راپەڕینەکانی کورد لە سالانی (١٩٢٠ و ١٩٩٣٠)دا تێک بشکێنێت. خەباتی رزگاریی کورد لە دوای ئەم تێکشکانانەوە کەوتە خامۆشیی دەیان ساڵەوە.*

*ساڵی ١٩٧٨ عەبدوڵا ئۆجەلان، کە یەکێکە لەو حەوت خوشکوبرایەی خێزانێکی جوتیاری هەژار، پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)، کە داوای سەربەخۆیی دەکات بۆ کوردەکان، دادەمەزرێنێت. ساڵی ١٩٧٩ ئۆجەلان لە تورکیاوە هەڵ دێت بۆ سوریا. ساڵی ١٩٨٤، (PKK)ی ئۆجەلان دەست دەکات بە خەباتی چەکداریی و هەزارەها لاوی کورد، کە چەوسانەوەی کولتووریی و زمان و هەژاریی ژێر دەستی حکومەتی تورکیی پاڵی پێوەدەنان، ڕێک دەخات. هێزی تورکییش، کە چەند ساڵێکە بنکەی ناو عێراق بەکار دێنێت، شەڕی دژی گریلای (PKK)ی دەست پێ کرد. ئەم شەڕە ژیانی نزیکەی ٣٠٠٠٠ کەسی لە نێواندا چووە"(١).*

## بەکارهێنانی کێشەی کورد لە لایەن سوریاوە

ماوەیەکی کورت پێش کۆدەتای سەربازیی لە (١٩٨٠/٩)دا، ئۆجەلان هەڵ دێت بۆ سوریا. بەڵام ئایا سوریا چۆن پێشوازیی ئۆجەلان دەکات؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەم مێژووی سەردەمدا هەیە. شای ئێران دەرگای لەسەر **مەلا مستەفا** بۆ ناکۆکیی خۆی لەگەڵ عێراقدا کردەوە. سوریاش کێشەی لەگەڵ تورکیادا کۆنە:

١ـ **کێشەی زەوی**. ناوچەی "هاتای" (الاسکندرون) لە کەناری رۆژهەڵاتی دەریای سپی، کە کەوتۆتە خوارووی تورکیاوە، پێش شەڕی دووهەمی جیهانیی لە لایەن فەرەنساوە خرایە سەر تورکیا. ئەمە هەرگیز لە لایەن سوریاوە قبوڵ نەکراوە.

٢ـ **کێشەی ئاو**. تورکیا بە ڕێگای پڕۆژەی بەربەستەوە رووباری فوراتی کۆنترۆڵ کردووە و شادەمارێکی گرنگی ژیانی سوریای خستۆتە دەستی خۆیەوە(٢). **هێمن** دەنووسێت: "بەتەواوبوونی پڕۆژەی ئاوی ئەنازۆل، ئاوی رووباری فورات ٦٠٪ کەمدەکات. ئەمە زیانێکی زۆر بە کشتوکاڵ لە عێراق و سوریا دەگەیەنێت. عێراق و سوریا چەندەها جار نارەزاییان دەربڕیوە دەربارەی کەمبوونەوەی ئاوی رووباری فورات. لەساڵی (١٩٩٣)دا سەرۆکی وەفدی تورکی (یشار یقیش)، لە لیژنەی ئاو لەگەڵ عێراق و سوریادا رایگەیاند کە تورکیا ئاوەکە لەسەر بناغەیەکی زانستی لەگەڵ عێراق و سوریادا بەشدەکات. سوریا ئەم پێشنیارەی رەتکردەوە. وەفدی سوریی (دەرویش) هۆی ناکۆکی ئاوی نێوان سوریا و تورکیا دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو ئاوەی لە رووباری فورات دەگاتە سوریا بەشی پێویستییەکانی سوریا ناکات، بەتایبەتیش کاتێک کە هێندێک لە ئاوەکە دەچێت بۆ عێراق. بۆیە سوریا داوای زیادکردنی ئاوی رووباری فورات دەکات. لەوەڵامدا تورکیا دەڵێت "هۆی گیروگرفتەکە ئەوەیە کە سوریا داوای میقدارێکی زیاتر لە ئاو دەکات لەوەی کە رووباری فورات هەیەتی، جا تورکیا لەکوێ ئەو ئاوە زیادە بهێنێت بۆ سوریا". هەروەها هێمن دەڵێت: "لە داهاتوودا، هێرشکردنە سەر سەرچاوەی ئاو تەنیا کارێکی تاکتیکی نابێت، بەڵکو دەبێتە مەبەستی سەرەکی شەرەکە". سێر(کریستۆن تیکێل)ی وەزیری پێشووی بەریتانیا لە نەتەوەیەکگرتووەکان و یەکێک لە ڕێکخەرەکانی کۆبوونەوەی زەوی لە ساڵی (١٩٩١)دا لە ریۆدیجانیرۆ دەڵێت: "ئاو لە نەوت زیاتر دەبێتە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ" وەزیری دەرەوەی میسری بوتروس غالی ساڵی ١٩٨٥ دەڵێت: "شەڕی داهاتوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەسەر ئاو دەبێت نەک لەسەر سیاسەت"(٣). تۆرگوت ئۆزال دەڵێت "لەم ناوچەیەدا ئاو تەنها بۆ ماوەی (١٥ـ٢٠)ساڵێک بەش دەکا، دوای ئەوە لەبەر ئاوکەمیی شەر دەست پێ دەکات". سلێمان دیمرێلیش دەڵێ "ئاوی خاکی تورکیا ملکی تورکیایە و نەوتیش موڵکی ئەو وڵاتانەیە کە

**•کارەساتی کورد ئەوە نییە شوانێکی باشی نییە، بەڵکو ئەوەیە تا ئێستاش وا دەزانێت دەبێت شوانی هەبێت**

**•کورد ئەمڕۆ ئەو مەرجانە پڕ ناکاتەوە کە سەربەخۆبوونی هەیەتی لە سەری**

**•ئیعدامکردنی ئۆجەلان سوودی تیا نییە بۆ تورکیا**



**وێنەی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی لەگەڵ مادەلێن ئۆلبرایت (وەزیری دەرەوەی ئەمەریکیی)**

نەوتیان هەیە. ئێمە داوای نەوتیان لێ ناکەین و ئەوانیش نابێ داوای ئاومان لێ بکەن"(٤).

سوریا دەبێت سەریەشە بۆ حکومەتی تورکیی دروست بکات. کێشەی کوردیش لە تورکیادا وزەیەکی زۆری تیادایە بۆ ئەوەی بەکار بهێنرێت دژی حکومەتی تورکیی. ئەمە دەرگای کردەوە بۆ **عەبدوڵا ئۆجەلان** کە بتوانێت سوریا و ناوچەی دەسەڵاتی سوریا لە لوبنان بکات بە بنکەی خۆی و لەوێوە ساڵی ١٩٨٤جولانەوە چەکدارییەکەی بخاتە گەڕ. ئاکامی شەڕی نێوانی PKK و حکومەتی تورکیی باس دەکرێت بە کوشتنی ٣٠٠٠٠کەس و سووتانی هەزارەها گوند و مایەی زیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە تورکیادا. پیاو وای دێتە بەرچاو کە سوریا ویستوویەتی تورکیا رابکێشێت بۆ سەر مێزی گفتوگۆیەک کە جولانەوەی چەکداریی کورد لە تورکیادا بگۆڕێتەوە بە دەسکەوت بۆ خۆی. بەڵام ئایا شتی وا دەتوانرێت روو بدات؟ بۆ ئەمەش وەڵامی مێژوویی سەردەم هەیە.

## رێکەوتنی دوو لایەن و دۆڕاندنی کورد

رۆژی ١٩٧٥/٣/١٢، دوای رێکەوتنی ئێران و عێراق لە جەزائیر، شای ئێران بە **مەلا مستەفا** دەڵێت: *کێشەی خۆمان لەگەڵ عێراق، کە ٤٢ساڵی خایاند، نەهێشت. کاتێک دوو لایەنیش رێک دەکەوون، لایەنی سێیەم کە ئێوەن یانی کوردەکان، دەیدۆڕێنن*"(٥). بەڵام ئەوەی شای ئێران لە رێکەوتنی جەزائیردا بە ئاشبەتاڵپێکردن بە جولانەوەی کورد ساڵی ١٩٧٥ لە عێراقی وەر گرت، بۆ سوریا ساڵی ١٩٩٨ نەلوا. ئەمڕۆ سوریا دەسەڵاتی ئاشکێت بەسەر تورکیادا. بۆیە سوریا بە فشاری PKK نەیتوانی حکومەتی تورکیی رابکێشێت بۆ سەرمێزێک جولانەوەی کوردی لە سەر بگۆڕێتەوە بە دەسکەوتێک بۆ خۆی. بەڵام توانی تورکیا بەرێت بەرەو ئەوەی کە سوپای لێ بهێنێتە سەر سنوور و هەڕەشەی جەنگی لێ بکات ئەگەر پشتگیریی خۆی بۆ PKK نەوەستێنێت. ئەمڕۆ تورکیا کە ئەندامی ناتۆیە و بنکەی سەربازیی ئەمەریکیی لێیە و لە گەڵ ئیسرائیل هاوکاریی هەیە، دەتوانێت بەگژ سوریادا بچێت. بە پێچەوانەی تورکیاوە، سوریا، دوای هەڵوەشانەوەی سۆڤییەت، بێپشت ماوەتەوە و ناچێتە شەڕێکەوە دۆڕاندنی مسۆگەر بێت. بۆیە رۆژی ٢١/ ١٠/ ١٩٩٨، لە رێکەوتنێکی سوریا و تورکیادا دەرکەوت کە سوریا دەبێت دەست لە PKK هەڵ بگرێت و سەرۆکەکەی لە وڵات دەر بکات.

بەم پێیە: ساڵی ١٩٧٩ عەبدوڵا ئۆجەلان بۆ دەسپێکردنی جولانەوەیەکی چەکداریی لە دەرگای تورکیاوە چووە سوریاوە. پاش ١٩ساڵ بۆ کوژانەوەی هەمان جولانەوە لە دەرگای روسیاوە لە سوریا دەرکرایە دەرەوە. ئایا جولانەوەیەک بە پشتگیریی سوریا دەستی پێ کردبێت بە هەوڵی تورکیا دەتوانرێت بکوژێتەوە؟

## یەکخستنی پارتی و یەکێتی لە واشنتۆن

ساڵی ١٩٩٢ یەکێتی و پارتی، پاش ئەوەی لە پەرلەمانەکەیاندا بڕیاریان لەسەر دا، بەجووت هێرشیان کردە سەر PKK. لە مانگی (٥)ی ساڵی (١٩٩٤)دا ئەم دوو هێزە کەوتنەوە شەڕ دژی یەکتریی. دەسەڵاتدارانی حکومەتی تورکیی هەمیشە ئەوەیان دووپات کردۆتەوە کە شەڕی نێوانی ئەم دوو هێزە بۆتە هۆی ئەوەی بۆشاییەک دروست بکات کە PKK سوودی لێ وەر بگرێت. بۆیە حکومەتی تورکیی هەمیشە بەرژەوەندیی لە دەستێوەردانی ئەم دوو هێزەدا هەبووە. چ بۆ یەکخستنیان بۆ لێدانی PKK چ بۆ ناوبژییان بە مەبەستی دەسبەتاڵیی پارتی بۆ شەڕی PKK. بۆ نموونە: پارتی لە مانگی (٣)ی ١٩٩٥ و لە (١٩٩٧/٥/١٤)دا و لە مانگی (١٠)ی ١٩٩٧ و مانگی (٥)ی (١٩٩٨)دا بۆ شەڕی دژی PKK لەگەڵ سوپای تورکییدا لە باشووری کوردستاندا بەشدار بووە(٦).

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کە پشتگری تورکیایە و ناوی (PKK)ی خستۆتە لیستەی رەسمیی تیرۆریستانەوە، رۆژی ١٩٩٨/٩/١٧، هەردوو سەرهێز (**جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی**)ی لە واشنتۆن لە وەزارەتی دەرەوەی کۆ کردەوە بۆئەوەی

بە شایەتیی نوێنەری ئەمەریکیی **داڤید ویلچ** (David Welch) بەیانی ڕێکەوتنێک مۆر بکەن. لەم ڕێککەوتننامەیەدا سەرهێزەکان جەخت لەسەر یەکێتی خاکی عێراق دەکەن و دەنووسن کە بێ هیچ دوودڵییەک بە سنووری دەوڵەتی عێراق ڕازین و بەڵێنی ئەوە دەدەن کە ڕێ لە پێشێلی ئەو سنوورە بگرن کە لە لایەن تیرۆریستان یان هەر کەسێکی دیکەوە دەکرێت. ئەو لیژنە هاوبەشەی کە درووستی دەکەن، لەوە دڵنیا دەکەنەوە کە هەردوو هێز بۆ ڕێگرتن لە بەزاندنی سنووری تورکیا و ئێران لە لایەن تیرۆریستانەوە، هاوکارن و دەبێت لیژنەکە ڕێگا لەو تیرۆریستانە بگرێت کە لەو سنوورانەوە دەپەڕنەوە. هەروەها لە کۆتایی بەیاننامەکەدا هەردوو سەرهێزی ناوبراو ئەوە دەردەبڕن کە کۆبوونەوەی داهاتووی ئەنقەرە، بە بەهێزکردنی ئاسایش لە سنووری عێراقدا، بۆ دابینکردنی سنوور و نەهێشتنی تیرۆر دەبێت.

هاوزەمان، ١٩ ڕۆژ دوای ڕێکەوتننامەکەی پارتی و یەکێتی، ڕۆژی ١٩٩٨/١٠/٦، تورکیا کە پێشتر سوپای بردبووە سەر سنوور، مۆڵەتی کەسانی سوپای دامەزراوی نێوانی تورکیا و سوریای هەڵوەشانەوە و دوا هەڕەشەی خۆی بەرامبەر بە سوریا ڕاگەیاند.

ڕۆژی ١٠/١٣ دەنگوباسی بەجێهێشتنی سوریای ئۆجەلان بڵاو بووەوە و ڕۆژی (١٠/١٩)ش ئۆجەلان ڕای گەیاند کە سوریای بەجێهێشتووە. ڕۆژی ١١/١٢ لە فڕۆکەخانەی ئیتالیا ئۆجەلان گیرا. ئۆجەلان، کە باشووری کوردستان نزیکترین شوێن بوو لێوەی، زۆر دوور بوو ڕوو بکاتە ئەوێ.

## PKK لە نێوانی هەولێر و نەیرۆبیدا

گەشتنە هەولێری سوپای تورکیی و پارتی لە (١٩٩٧/٥/١٤)دا بۆ لێدانی PKK سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ حکومەتی تورکیی و داگیرکەرانی کوردستان. جگە لەوەی کە حکومەتی تورکیی بێباکانە چنگی گەیشتە شارێکی کوردستان و دەرسێکی مێژوویی چاوشکێنیی خەڵکی کوردی دادا کە کاریگەریی خۆی بەجێ دێڵێت، غەدرلێکراویی و بێمافیی خەڵکی کوردیشی پیشان دا کە سوپای داگیرکەرێکی وەکو تورکیا بەناویدا سەربەستانە تێ دەپەڕێت بەبێ ئەوەی کاردانەوەیەکی سرووشتیی لێ ببینرێت و لەشی بەم کارە پیسە لیرێک بکات. ئەمە بە پێچەوانەی منداڵانی فەلەستینیی کە بەرد دەگرنە سوپای ئیسرائیلیی، یان چینیی کە لەسەر بەهەڵەبۆمبارانی سەفارەتیان لە لایەن ناتۆوە لە یۆگۆسلافیا دەیکەن بە هەرا. دیارە ئەمەش ئاکامی ناپاکیی نەتەوایەتیی و مرۆڤایەتیی مێژوویی هێزەکانی باشووری کوردستانە کە توانییویەتی *کاردانەوەی بەرگرییانەی سروشتیی* لە خەڵکەکە بسڕێتەوە. ئەم "کاردانەوە بەرگرییەی کە بە دژایەتی دەرەکی بەهێزتر دەبێت، دوژمنان دەتوانن لە ڕێگای بەکارهێنانی کوردەکە خۆیەوە لەسەرەوە لیی بدەن و نەخۆشی بخەن. ڕاوی PKK لە لایەن حکومەتی تورکیاوە کە لە کوردستانی عێراق بە هاوکاریی هەردوو هێزی پارتی و یەکێتی دەستی پێ کرد و بە بەجێهێشتنی سوریا و گەیشتنە ئەورووپای ئۆجەلان کۆتایی پێ نەهات. دادگای ئیتالیی، کە سیستێمی دادیان ڕێگا نادات کەسێک تەسلیم بکاتەوە بە وڵاتێک کە سزای ئیعدامی هەبێت، ڕۆژی ٢٨ /١١ داوانامەی حکومەتی تورکیی ڕەت کردەوە کە داوای تەسلیمکردنەوەی ئۆجەلانی دەکرد بە تورکیا. هەر هەمان ڕۆژ، کۆمەڵێک تورک لە ستۆکهۆڵم بە خۆپیشاندانێک لە بەردەمی سەفارەتی ئیتالیادا داوای ناردنەوەی ئۆجەلانیان کرد بۆ تورکیا. ئەم تورکانە لافیتەیەکیان هەڵگرتبوو کە لێی نووسرابوو "*سپاگێتییەکەتان پیس مەکەن!*" خۆپیشاندانەکە ڕێکخراوی تورک-سویدیی سپۆنگا ڕێکی خست بوو. پارتییش بەناوی وەزیری دادیەوە نامەیەکی سالڕۆژلێدراوی (١٩٩٨/١٢/١١)ی دا بە وەزیری دادی ئیتالیی کە تیایدا (PKK)ی تاوانبار کردووە بە تیرۆر، وێرانکاریی، فڕاندن و ئازاردانی خەڵکی مەدەنی (تەماشای دەقی نامەکە بکە لەم ژمارەیەدا).

لە تورکیا لە دەرەوەی تورکیا خۆپیشاندان و ناڕەزایی و بۆیکۆتی کۆمپانیاکانی ئیتالیا بۆ تەسلیمکردنەوەی ئۆجەلان لە لایەن تورکەوە دەستی پێ کرد. تێکستی (TV)ی سویدیی ڕۆژی ١٢/٤ نووسیبووی: "*وەزیری پیشەسازیی ئیتالیا لە ماوەیەکی کورتدا دەچێت بۆ تورکیا بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکات دەربارەی ئەو مانلێگرتنە بەرفراوانەی لە تورکیا دەستی پێ کردووە بەرامبەر بە کەلوپەلی ئیتالیی. زۆر لە تورکەکان، لە ناڕەزاییاندا دەربارەی نەدانەوەی ئۆجەلان بە تورکیا، ئامادەنین کەلوپەلی ئیتالیی بکڕن. وەزارەتی پیشەسازیی لە ڕۆم خەریکی ڕێکخستنی دانیشتنێکە لە نێوانی وەزیری پیشەسازی و کاربەدەستانی تورکدا. زۆر لە کۆمپانیاکان، لە وانە فیات، بێنیتۆن پیرێلی، بەر ئەو مانلێگرتنە نا ڕەسمییەی تورکیا کەوتوون*"(٧).

ڕۆژی ١٢/١ سەرۆکوەزیرانی ئیتالیا لە پرۆگرامێکی ڕادیۆدا ئۆجەلانی ناو برد بە "تیرۆریست" و ڕوونی کردەوە کە ئێستا دەچێتە ژوورەوە بۆ ئەوەی مەحکەمەیەک پێک بهێنێت کە لەو دەعوایانە بکۆڵێتەوە کە لەسەر ئۆجەلانە. هەروەها وتی: "ئێمە پێویستە لە هەموو توانایەک بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی مەحکەمەی ئۆجەلان دادپەروەرانە بێت، دووپاتی دەکەمەوە: مەحکەمەیەکی دادپەروەرانە". ئەمەی لە پرگۆگرامێکی ڕادیۆدا وت، کە گوێگران دەیان توانی بەشداریی بکەن(٨).

عەبدوڵا ئۆجەلانیش کە پێشتر ئامادەیی خۆی پیشان دابوو بۆ وەستان لەبەردەمی دادگایەکدا، ڕۆژی ١٢/٧ لە ڕۆژنامەی لا ستامپا (La Stampa)ی ئیتالییدا، دووپاتی کردەوە کە ئامادەیە لەبەردەمی مەحکەمەی جیهانییدا بوەستێت. ئەوەشی خستە سەر کە چ تورکیا و چ ئەو دەوڵەتانەی کە بە چەک یارمەتی تورکیایان داوە، لە پێش هەموویانەوە ئەڵمانیا، دەبێت ڕابکێشرێنە بەردەمی دادگا. ئۆجەلان وتبووی با ئەوسا بزانین کێ تاوانبارە، ئێمە یان تورکیا(٩). بەڵام ئەورووپا، کە تارمایی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە پشتییەوە وەستاوە، ئاسان نییە بتوانێت دادگایەک دانێت بۆ ئۆجەلان کە ئاکامیی سیاسی هەبێت و مەترسی ئەوەی هەبێت کە کێشەی کورد بخاتە حسابی سیاسییەوە؟ بە تایبەتی لەم کاتەدا کە تورکیا لەگەڵ وڵاتانی تری ناتۆدا، لە بۆمبارانی یۆگۆسلافیادا بەشدارە. بۆیە ئاسایی بوو هەواڵەکان ئەوە پیشان بدەن کە کێشەی ئۆجەلان بەرەو بەندەرێکی تر دەڕوات. دوای ١٢ ڕۆژ تێپەڕبوون بەسەر ناوبردنی *مەحکەمە دادپەروەرانەکەی* سەرەکوەزیرانی ئیتالیادا، بە پێی تەلەفیزیۆنی سویدیی ڕۆژی ١٩٩٨/١٢/١٢ عەبدوڵا ئۆجەلان لە تەلەفیزۆنی (Med-TV)دا پێشمەرگەکانی خۆی بە پیاوکوژ دەچوێنێ و وای دەردەبڕێت کە ئەمە ١٥ساڵە بە قسەی ئەو ناڕۆن بەرێوە و ئەگەر خۆیان نەگۆڕن ئەوا ئەو واز لە سەرکردەیی دێنێت. هەروەها لە هەمان کاتدا تەلەفیزۆنی سویدیی نوسیبووی کە ئەمڕۆ ڕۆژی ١٢/١٤ هەشت هەزار کورد بۆ پشتگیریی ئۆجەلان دەستیان بە مانگگرتن لە خواردن کردووە و چەند ناڕەزاییەکی تری لەم بابەتە دەستی پێ کردووە(١٠). بەپێی ڕۆژنامەی داگنس نیهێتەری سویدییش (DN) ڕۆژی ١٢/١٥ ئۆجەلان لە تەلەفوندا لەگەڵ Med-TV ئێوارەی ١٢/١٢ بە پێشمەرگەکانی ڕا دەگەیەنێت کە چەک دانێن و هەرچییەکیان لە تواناندایە بیکەن بۆ ئەوەی چارەسەرێکی سیاسی بدۆزنەوە بۆ شەڕەکە(١١). بەڵام چارەسەری سیاسی هەرگیز لەدەستی کورددا نەبووە. ئۆجەلان پێش ئەوەش لە سوریا دەر

## شێخ مەحمود: دادگای هیچ داگیرکەرێک ڕەوایی دادگاییکردنی نییە

بکرێت لای خۆیەوە یەکلایەنیی شەڕی وەستاندووە و لە داوای سەربەخۆییش دابەزیووە. بەڵام حکومەتی تورکیی لەبنەڕەتدا دان هەر بە کورددا نانێت تا بتوانرێت قسەی لەگەڵدا بکرێت. کۆمەڵناسی تورک، ئیسماعیل بێشکچی، لە سەرەتای نەوەدەکاندا وتوویەتی تورکیا ئامادەیە هەر بۆ لەناوبردنی عەبدوڵا ئۆجەلان هەموو بۆجەی ساڵێکی خۆی تەرخان بکات(١٢).

دوای ئەوەی ئەڵمانیا، کە ئۆجەلان داواکراو بوو لێی، ڕەتی کردەوە ئۆجەلان وەر بگرێت، دەر کەوت کە هیچ دادگایەکی لە ئەوروپا بۆ دانانێن و ئەمەش ئەوەی پیشان دەدا کە داواکردنی تەسلیمکردنەوەی ئۆجەلان لە لایەن تورکیاوە تەنها قسەی بەتاڵ نییە و بناغەیەکی هەیە. ئۆجەلان لە ئەوروپا تاوانبار کرابوو بەوەی کە دەستی لە پیاوکوشتندا هەبوویێت لە ئەوروپا.

ڕۆژی ١٢/١٥، عەبدوڵا ئۆجەلان هەڕەشەی کرد کە ئیتالیا بەجێ دێڵێت ئەگەر مەسەلەکەی چارەسەرێکی سیاسی بۆ نەدۆزرێتەوە. هەروەها وتی کە ترسی ئەوەی هەبووە دەرکرێت بۆ ئەلبانیا کە تورکیا دەتوانێت هێزی تایبەتی بنێرێت(١٣). ڕۆژی ١٩٩٩/١/١٦، ئیتالیا ڕایگەیاند کە ئۆجەلان ئەوێی بەجێهێشتووە. ئۆجەلان لە هەوڵی دۆزینەوەی پەناگەیەکدا دوا شوێنی نیروبی بوو لە کینیا بوو. لەوێ درایەوە دەست حکومەتی تورکیی و ڕۆژی ١٩٩٩/٢/١٦ لە فڕۆکەیەکدا بەرەو تورکیا، کە دیار بوو تازە بەنج بەری دابوو، چاوی بەستراوی لەناو دەستی دوژمنێکی دڕندەدا کردەوە. عەبدوڵا ئۆجەلان وتی: "من تورکیا و گەلی تورکییم خۆش دەوێت. دەمەوێت خزمەتیان بکەم. ئەگەر بتوانم خزمەتیان بکەم، ڕازی دەبم".

بۆ دوژمنی کورد کوردستان هەر کوردستانە لە هەولێربێت یان لە نەیروبی. بلند ئەجەویدی سەرۆکوەزیران چنگی خوێناویی بەرز دەکاتەوە و دەستی درێژیمان بۆ دەرسدادانێکی تر پیشان دەدات و دەڵێت: "هەموو لایەک دەبێت لەوە تێ بگات کە کەس ناتوانێت بەرامبەر بە دەوڵەتەکەمان بووەستێتەوە و کەس بە تیرۆری جیاخوازیی ناتوانێت بەهیچ بگات لە تورکیا". هەروەها سەرکەوتنی خۆی لەسەر حسابی کورد پیشان دەدا و دەڵێت: "ئێمە بەڵێنی ئەوەمان دابوو کە حکومەت ئۆجەلان بگرێ و وا گفتەکەی خۆمان بردە سەر".

### شێخ مەحمود ئەو هاوارەی بۆ خۆی نەکرد

شای ئێران لە حەفتاکاندا شێخ شەهاب و هاوڕێکانی تەسلیم کردەوە بە عێراق. حکومەتی ئێران هەرچەندە داگیرکەرێکی کوردستان بوو، بەڵام جێگای چاوەڕوانیی نەبوو دەستەیەک پەنابەر بداتەوە دەست ئەو وڵاتەی لێی هەڵهاتوون. حکومەتی عێراق **شێخ شەهاب و جەعفەر و ئەنوەری** ئیعدام کرد.

سیستەمی دادی هیچ وڵاتێکی ئەوروپا ڕێگای بەوە نەدەدا حکومەتەکەی عەبدوڵا ئۆجەلان ڕاستەوخۆ تەسلیمی تورکیا بکاتەوە. سیستەمی سیاسی هیچیشیان ئەوەندە لە دوا نییە بواری ئەوە بدات لە ناوچەی خۆیدا ئیهانە بە سنووری پارێزراوی وڵاتەکەی بکرێت و ئۆجەلان لەسەر خاکی ئەو بفڕێنرێت. بەڵام حکومەتەکانی ئەوروپا توانیان دەرگاکانیان لەسەر ئۆجەلان داخەن، تەنها ڕێگا بۆی بهێڵنەوە ڕێگای نەیرۆبی و تورکیا بێت. وڵاتانی ئەوروپی توانیان خۆیان لە سکاندالێکی یاسایی بپارێزن، بەڵام گرتنی ئۆجەلان مۆراڵی سیاسییان دەخاتە بەر پرسیار. ئەمە کام ئەوروپا بوو کە بەسەر مافی پەنابەریی و دادگای ئەوروپییدا سەرۆکی پارتێکی کورد دەکەوێتەوە دەستی ئەو حکومەتەی کە لە دەستی ڕای کردووە؟ حکومەتێک کە سەربازەکانی وێنە بە سەری بڕراوی کوردەوە دەگرن. حکومەتێک کە خاکی میللەتێکی تری داگیرکردوە و نایەڵێت خەڵکەکەی زمانی زکماکی خۆیان بەکار بهێنن و دان بە بوونی سروشتییاندا نانێت؟ ئایا وڵاتانی ئەوروپا هەڵوێستییان چی بوو بەرامبەر فڕاندنی ئۆجەلان بۆ ئەو وڵاتەی کە لێی هەڵهاتووە و هەزارەها کەس لەوێوە پەنابەریی سیاسی لە دەست ئەم وڵاتە لای خۆیان وەر گرتووە؟

تێکستی تەلەفیزۆنی سویدی لەژێر ئەم ناونیشانەدا "*مەحکەمە داوای دادپەروەریی دەکات بۆ ئۆجەلان*" نووسی کە مەحکەمەی ئەوروپا بۆ مافە مرۆڤایەتییەکان داوا لە تورکیا دەکات کە هەڵسوکەوتێکی دادوەرانە لەگەڵ ئۆجەلان لە مەحکەمەدا بنوێنێت. هەروەها مەحکەمە داوای کرد کە پارێزەرەکانی ئۆجەلان بە تەواویی بۆیان هەبێت ئۆجەلان ببینن. بەڵام ئایا دادگایەک تورکیا دایبنێت بۆ ئۆجەلان چ دادگایەکە و ئەو ئەوروپایە خۆی کێیە؟ وەڵامی مێژووییمان بۆ ئەم دوو ئەم پرسیارەش هەیە.

شێخ مەحمود پاش ئەوەی لە شەڕی دەربەندی بازیاندا بە دیلی دەگیرێت و دەنێردرێت بۆ بەغداد، ڕۆژی ١٩١٩/٧/٢٥ بەوە تاوانبار دەکرێت کە ڕووبەڕووی ئینگلیز بۆتەوە و بەیداخی بەریتانیی داگرتووە و لە شوێنیدا بەیداخی حکومەتی کوردی چەقاندووە. ڕەفیق حیلمی دەڵێت: "ئەو تاوانانەی کە درابوونە پاڵ شێخ مەحمود بریتی بوون لە مانەی خوارەوە:

١- ڕاستبوونەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارانە بەرامبەر بەریتانیای گەورە و ڕژاندنی خوێنێکی زۆر.

٢- داگرتنی بەیداخی حکومەتی بەریتانیای گەورە و دڕاندنی و هەڵکردنی بەیداخی کوردستان."

شێخ مەحمود ملی نەداوە پارێزەری بۆ دابنێن و بەرامبەر بەو تاوانانەی کە درابووە پاڵی و لە مەحکەمەکەدا دەڵێت:

"ئەندامانی ئەم مەحکەمەیە لە دوژمنان پێکهاتوون. من خۆم بە تاوانبار نازانم هەتا پێویستم بە موحامی هەبێت. ڕاستبوونەوە و ڕاپەڕینم بەرامبەر بە ڕەفتار و کردەوەی نارەوای ئینگلیز و بێبەڵێنییان بووە بەرامبەر بە کورد، من بۆ پاراستنی وڵات و سەندنی مافی ڕەوای کورد بەرامبەر بە ئینگلیزی داگیرکەر ڕاست بوومەوە. چوونم بەگژ هێزەکانی ئینگلیزدا بە ئەرکی سەرشانی خۆم زانیووە، من ئینگلیزەکان بە تاوانبار دائەنێم بەرامبەر بەو خوێنەی کە ڕژاوە."

ڕەفیق حیلمی دەنووسێت: "بەڵام مەحکەمەی عەسکەریی بەریتانیی گوێی لەمانە نەگرت و بەراست و بەرۆ شێخ مەحمودی موحاکەمە کرد و بریاری خنکاندنی درا".

ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا کە دژی ئەوە بووە حوکمی کوشتنی شێخ مەحمود بگۆڕێت بۆ دە ساڵ و بە بەندیی بنێردرێت بۆ هندستان دەنووسێت: "لە نەخۆشخانەی بەغداد چوومە لای شێخ مەحمود و سەرێکم لێ دا. لە کاتی گفتوگۆدا بەبێ وەستان و سڵکردنەوە پێی وتم: نەک دادگای عەسکەریی ئینگلیز بەڵکو هیچ دادگایەکی تریش مافی ئەوەی نییە موحاکەمەی من بکات(١٢).

شێخ مەحمود ئەم هاوارەی بۆ خۆی نەکرد. باخی میللەتێک هەموو کاتێک یەکێکی وا ناگرێت لەبەردەمی مردندا و بە هێزی مێژوویەک ئەم پرەنسیپەمان بۆ تۆمار بکات: "دادگای هیچ داگیرکەرێک ڕەوایی دادگاییکردنی نییە". ئەمە بێهێزیی خۆمانە کە

ناتوانین بچینە ژێر باری ئەو ئەرکەوە کە شێخ مەحمود هەشتا ساڵ لەمەوبەر بۆی تۆمار کردین. ئەرکێک کە بەدرێژایی ئەو هەشتا ساڵە لەژێر چەندین پڕۆپاگەندە و بەناوی ئایدۆلۆجیی و فکرەوە خۆڵ دەکرێت بەسەریا. تازە بە تازە کورد مێژوونوسی ناسراوی "**کەمال مەزهەر**" لە ژێر دەسەڵاتی **عەلی حەسەن مەجیدەوە** داوای لێبوردن لە سیمبۆلێکی ناپاکیی نەتەوایەتی کورد "**موشیری حەمەی سلێمان**" دەکات و بە بیری قوڵی بەردەقارەمان دەکات بە تاشەبەرد.

وڵاتانی ئەوروپیی، کە بەریتانیا زلهێزێکیتی، دوای ٨٠ ساڵ لەم رووداوە مێژووییەوە وای داناوە کە دەسەڵاتی داگیرکەر، کە بە پێی پرەنسیپی شێخ مەحمود رەوایی دادگاییکردنی نییە، دادگاییەکی دادپەروەرانەی ئۆجەلان بکات. PKK لە خاکی کوردستاندا شەڕی کردووە و دەسەڵاتی تورکیا کە کوردستان بەجێ ناهێڵێت لەبەرئەوە نییە کە PKK دیموکرات نییە و ناتوانێت کۆمەڵگای کوردستان باش بەرێت بەڕێوە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە خۆی دەسەڵاتێکی ناڕەوا و تاوانکارە. تیرۆر و توندڕەوی PKK نیشاندەری ئەو بارە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەیە کە داگیرکردنی کوردستان دروستی کردوە و لایەنێکی زۆڵموزۆری حکومەتانی تورک دەر دەخات.

عەبدوڵا ئۆجەلان لە دوای هاتنەدەرەوەی لە سوریا و لەناو پرۆسێسی مەحکەمەی تورکییدا، سەربەست لەوەی بە دوای دەرکردنی ژیانی خۆیدا بگەرێت یان نوێنەرایەتی کێشەی کورد بکات، گرنگە بۆ ئێمە وەکو پرەنسیپی یەکەم ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە: مەحکەمەی دەسەڵاتی داگیرکەر بەچاک و بە خراپ رەوایی بڕیاردانی نییە. ئەمەش سەرچاوە لەو راستییە سادەیەوە وەردەگرێت کە "سەربەستی میللەتان دەسکەوت نییە، مافێکی سروشتییە". هەر بۆیەش: "جیابوونەوە و پێکهێنانی حکومەتی سەربەخۆ مافێکی موتڵەقە نەک نیسبی". واتە، چونکە ئەم مافە سەرچاوە لە بنەڕەتێکی سروشتییەوە وەردەگرێت، رەوا نییە بخرێتە ژێر مەرجێکەوە کە سەرچاوەکەی ئایدولۆجی و فکر بێت. مەرجی وەکو ئەوەی کە بۆ نموونە پارتە کۆمونیستەکان لە بەرنامەکانیاندا دان بە سەربەخۆیی کورددا دەنێن، بەڵام بەمەرجێک لەگەڵ هەندێک پێوانەی خۆیاندا بێتەوە.

نیوەی ئەوەی لێمان روو دەدات خۆمان لێی بەرپرسیارین. ئەوەی لایەنەکەی تر بەرامبەرمان دەیکات هەڵەیە رەخنەی لێ بگیرێت، دەبێت تێی بگەین. ئەوەی بۆ رەخنە راستە ئەوەیە کە خۆمان دەیکەین. من وا هەست دەکەم کورد ئەمڕۆ بە گشتی بە پێچەوانەی ئەمەوە دەجوڵێتەوە. رەخنە لە لایەنەکەی تر دەگرێ و تێگەشتنی هەیە بۆ ئەو شتەی خۆی دەیکات و لای براوەیە. دوورە لەوەی پرسیار بەرەو رووی خۆی بکاتەوە. ئەرێ من خۆم کێم کە بەم جۆرە ناوم دەبەن؟ چۆنم کە بەم شێوەیە دەمبینن؟ چی دەکەم کە ئاوا لەگەڵما دەجوڵێنەوە؟ ئێمە خۆمان بەگشتی چۆن دەجوڵێینەوە، چی دەکەین و چی دەڵێین، بەگشتی پابەندی کولتوورە زاڵەکەیە (دەربارەی ئەم کلتوورە تەماشای ژمارە ٣ بکە). رۆژی ١٩٩٩/٢/٢٠ نزیکەی ٦٠٠٠کورد لە ستۆکهۆڵم بۆ خۆپیشاندانێک کۆبوونەوە. سلوگانی زاڵی خۆپیشاندانەکە ئەمانە بوون: "کوردستان ئۆجەلان، ئۆجەلان کوردستان". هەروەها: "ئۆجەلان خەڵکە و خەڵکیش ئێمەین". هیوادارم کوردێک هەبووبێت لە قوڵایی ئەم سلوگانانە تێ گەشتبێت. پێش ئەوەی کۆتایی بە وتارەکەم بێنم دەڵێم: خۆپیشاندانەکە کوردستانی خستە سەر ئۆجەلان و ئۆجەلانیش لە دەستی تورکدا بوو. ئەمانە چی دەگەیەنن؟

کورد ئەمڕۆ ئەو مەرجانە پڕ ناکاتەوە کە سەربەخۆبوونی هەیەتی لەسەری. کارەساتی کورد ئەوە نییە کە شوانێکی باشی نییە، بەڵکو ئەوەیە کە تا ئێستاش وا دەزانێت دەبێ شوانی هەبێت.

## چارەنووسی ئۆجەلان چییە؟

دوو فاکتەری سەرەکی لە ئیعدامکردن و نەکردنی ئۆجەلاندا رۆڵ دەبینێت:

١- **نەریت**: ئۆجەلان بەتاوانی ناپاکیی گەورە دراوە بە دادگای تورکی و سزاکەی کە دادپرس لە دادگادا داوای بۆ کردووە ئیعدامە. جێبەجێکردنی ئەم یاسایە دەتوانێت وزە لە دواکەوتوویی و شۆڤینیی تورکەوە وەر بگرێت، زیاتر رق و تۆڵە دەگەیەنێت و سوودی تیادا نییە بۆ تورکیا.

٢- **ژیریی**: ئەم فاکتەرەیان دەیەوێت ژیریی بکات بە بناغەی بڕیار. ئایا ئیعدامکردن و ئیعدامنەکردنی ئۆجەلان سوود یان زیانی چیە بۆ تورکیا؟ ئیعدامنەکردنی ئۆجەلان دوو سوودی هەیە بۆ تورکیا. یەکەم، هاریکاریکردنی ئۆجەلان وەکو خۆی دەڵێت دەتوانێت مەسەلەکە ببڕێنێتەوە. دووەم، تورکیا کە لە دوای ساڵی (١٩٨٤)ەوە کەسی ئیعدام نەکردووە، دەتوانێت ئیعدامنەکردنی ئۆجەلان لەبەردەمی ئەوروپادا بکات بە وەرەقەیەک بە دەست خۆیەوە.

ئەم دوو فاکتەرە کامیان بەسەر کامیاندا زاڵ دەبن، ئەوە زەمەن وەڵامی دەداتەوە. هەرچەندە مەسەلەکە ئیعدامکردنێتی، بەڵام نەکردنی مەحاڵ نییە.

### سەرچاوەو پەراوێز


١- ژمارەی: ٢٥/٢-٣/٣/١٩٩٩، گۆڤاری تێمپوسی سویدی (Tempus)
٢- ژمارەی: ٢٢/١٠/١٩٩٨، رۆژنامەی داگنس نیهێتەری سویدیی(DN)
٣- هێمن، ل٤، ژمارە: ٢، گۆڤاری *کۆنتراکت*
٤- ل٨٢، ژمارە: ٢، گۆڤاری *باسکار*
٥- ل: ٨٩، الحزب الديموقراتي الكردستاني/ اللجنه التحضيريه، تقييم مسيره الحركه الكرديه وانهيارها والدرس والعبر المستخلسه منها.
٦- عومەر شێخموس، ل:٣٠، ژ:٢، گۆڤاری *کۆنتراکت*
٧- رۆژی: ٤/١٢/١٩٩٨، تێکستی(TV)ی سویدی
٨- رۆژی ١/١٢/١٩٩٨، تێکستی (TV)ی (٤)ی سویدی
٩- رۆژی٧/١٢/١٩٩٨، تێکستی تەلەفیزۆنی (٤)ی سویدیی
١٠- رۆژی ١٤/١٢/١٩٩٨، تێکستی (TV)ی سویدی
١١- ژمارەی: ١٥/١٢/١٩٩٨، رۆژنامەی داگنس نیهێتەری سویدیی(DN)
١٢- مەهاباد کوردی، سەرۆک ئاپۆم چۆن ناسی، ژ:٢٣، گۆڤاری گزنگ
١٣- محەمەد رەسوڵ هاوار، ل:٥٢٢، ٥٢٣، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان.
١٤- رۆژی ١٥/١٢/١٩٩٨، تێکستی (TV)ی (٤)ی سویدی
١٥- رۆژی ٥/٣/١٩٩٩، تێکستی (TV)ی سویدی


**ئایا مێژوو بە بیری قووڵ دەنووسرێتەوە؟**

**وەڵامێک بۆ د. کەمال مەزهەر**

**دەربارەی کێشەی موشیری حەمەی سلێمان**

**ژمارەی داهاتوو**

**نووسینی: ناڵە**

# ساڵی 2000

پێنج مانگی دیکە سەدەیەک تەواو دەبێت و سەدەی بیستویەک دەست پێ دەکات. لەراستیدا پێنج مانگی دیکە سەرەتای هەزارساڵی دیکەیە. لە ئێستاوە، لە جیهاندا ناوی ئەو مرۆڤانە باس دەکرێن کە رۆڵێکی گەورەیان لە مێژووی ئەم هەزارساڵەی مرۆڤایەتیدا هەبووە. یەکێک لەو ناوانەی کە شایانی باسکردنە گالیلۆیە کە سەرەڕای ئەوەی دەیزانی کڵێسا سزای دەدا، لە ساڵی (1613)دا لایەنی کۆپەرنیکۆسی گرت کە دەیگوت خۆر چەقی کەونە و زەوی یەکێکە لەو ئەستێرانەی کە بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە. لەساڵی (1633)دا کڵێسا گالیلۆی حوکم دا. لەساڵی (1993)دا، واتە 360 ساڵ دوای حوکمدانی گالیلۆ، کڵێسا دانی بەهەڵەکەیدا نا و ناوی گالیلۆی لە لیستەی رەشدا لابرد. رەنگە گالیلۆ و ئەنشتاین و ماندێلا و هێندێک کەسی دیکەی وەک ئەوان خەڵاتی مرۆڤی هەزارساڵەیان ببەنەوە. بەرامبەر بەوان هیتلەر و هێندێکی دیکە رەنگە خەڵاتی گەورەترین زیان بە مرۆڤایەتی ببەنەوە.

ئەو هەلانەی کە بۆ میللەتێک هەڵدەکەون، هێندێکیان خۆی بەئاگاییەوە و هێندێکیشیان بارودۆخی گشتیی دروستیان دەکات. میللەتی کورد، لە خوارووی کوردستان لە دوای شەڕی کەنداو سوودیان لەو بارودۆخە گشتییە بینی کە رژێمی عێراقی بێهێزکردبوو و هەلێکیان بۆ خۆیان رەخساند: راپەڕین و دامودەزگای رژێمی عێراقییان لەشارەکاندا لە بنەوە هەڵتەکاند. بەداخەوە بەردەوامی ئەو هەلە مێژووییە لەدوو لایەنەوە رێی لێ گیرا: ئەو رێکخراوە کوردییانەی کە هیچ بەرنامەیەکیان بۆ بەڕێوەبردنی ئەو ناوچەیە پێ نەبوو، دەستەڵاتیان گرتە دەست. دووەمیش، رژێم هێرشی کردە سەر شارەکان و خەڵکەکەی ئاوارە کرد. ئەوەی جێی تەوسە ئەوەیە کە وەدەرنانی دوو ملیۆن کورد و بۆمبابارانکردنی شارەکان هەلێکی زۆر گەورەتری بۆ کورد دروست کرد و مەسەلەی کوردی کرد بە یەکەم خاڵ لەسەر خشتەی کاری زلهێزەکان. ئەم هەلەش لەبری ئەوەی لەلایەن ئەو رێکخراوە کوردییانەوە، کە بەناو "نوێنەرانی" کورد بوون، بقۆزرێتەوە بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتێکی گەورە، هەر بەساوایی دەست و قاچی بڕرا کاتێک سەرانی رێکخراوەکان بۆ ماچکردنی سەددام لە بەغدا ریزیان گرت و تەلەفیزیۆن و رۆژنامەی جیهانی بڵاوی کردەوە. لەبری ئەوەی داوای ئەوە بکەن بچن لە نەتەوە یەکگرتووەکان باسی مەسەلەی کورد بکەن یان داوای ئەوە بکەن کە کوردیش نوێنەرێکی هەبێت لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا، سەرانی کورد مەسەلەکەیان بردەوە بەردەمی سەددام. بەڵام ئەم کارەی سەرانی رێکخراوە کوردییەکان چارەسەری دوو ملیۆن کوردی دەربەدەری نەکرد بۆیە زلهێزەکان زۆنێکیان دروست کردو خەڵکیان هاندا کە بگەڕێنەوە بۆ شارەکان. دروستبوونی ئەو زۆنە سەرەڕای کاری چەوتی رێکخراوە کوردییەکان هەلێکی زۆر گەورەی بۆ کورد دروست کرد: لە سێ شاری گەورەی کوردستاندا دەستەڵاتی رژێم لابرا و سەرباز و پۆلیسی رژێم نەمان، رێکخراوە ئینسانییەکان کەوتنە بنیاتنانەوەی گوندە کوردییەکان، لە هەمووی گرنگتر، فرۆکەی گەورەترین زلهێز پارێزگاریی زۆنەکەی دەکرد. بەکورتیی، سنوورێک بۆ کورد لە خوارووی کوردستان دروست کرا کە تێیدا، دوور لە دەستەڵاتی رژێمی عێراقی، حوکمی خۆی بکات. لە راستیدا بەو کارە، نیمچە دەوڵەتێک بۆ کورد دروست کرا کە مەسەلەی کوردی بە بەردەوامی لە دەزگای راگەیاندنی جیهانیدا هێشتەوە. ئەو هەلە مێژووییە ئەمرۆ لەکوێیە؟ ئەو دەستەڵاتە کوردییانەی کە لەو زۆنەدا حوکمیان دەکرد هیچ لێپرسراوییەکی ئابووری، سیاسیی، سەربازیی لەسەر نەبوو، کەچی ئەو هەلە مێژووییەیان کردە گەورەترین سووکایەتی بە مەسەلەی کورد. ئەو هەلانەی کە دروست دەبن وەیان دروست دەکرێن نرخێکی مێژوویی خۆیان هەیە، بەڵام لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە هەموو هەلێک قوربانییەکی خۆی هەیە. هەتا هەلە مێژووییەکە گەورەتر بێت قوربانییەکەشی گەورەتر جەرگبڕتر دەبێت. بۆیە نەقۆزتنەوەی ئەو هەلانە تەنیا نەگونجاویی رێکخراو و لایەنە سیاسییەکان ناگەیەنێت، بەڵکو گەورەترین سووکایەتیشە بەو قوربانیانە.

بەپێی هێندێک لە "مێژوونووسانی" کورد، لە نەورۆزی ئەم ساڵدا، مێژووی کورد (2612) ساڵی پڕ کردەوە. ئەگەر ئێمەش بمانەوێت ناوی ئەو کەسانە بنووسین کە کارەکانیان رۆڵێکی گەورەیان لە مێژووی کورددا بینیوە، ناوی ئەحمەدیخانی و شەرەفخانی بەدلیسیمان بە بیردا دێت کە مێژووی کوردییان نووسییەوە، شێخ مەحموودی نەمرمان بەبیردا دێت کە دانی بە مەحکەمەی ئینگلیزدا نەنا و ئاڵای کوردستانی هەڵکرد، قازی محەممەدمان بیردەکەوێتەوە کە لە پێناوی میللەتەکەیدا پەتی قەنارەی هەڵبژارد، خێزانی بەدرخانەکانمان بە بیردا دێت کە وڵاتانی ئەورووپا دەگەڕان بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد بە سیاسییەکانی ئەورووپا بناسێنن. بەرامبەر بەو ناوانە سەرکردەی رێکخراوەکانی باشووری کوردستانمان بە بیردا دێ کە لە کاتێکدا دوو ملیۆن کورد بە شاخەوە بوون و رۆژی بەدەیان منداڵ لەسەرما یان بە نەخۆشی دەمردن، ئەوان لەسەرەی ماچکردنی سەددام حسێندا لە ریزی پێشەوە بوون. بێکەسی نەمر پەنجاوپێنج ساڵ لەمەوبەر ئەم هاوارەی کرد:

**سەدەی بیستەمە کوردە غیرەتێ      لەخەو راپەڕە، هەوڵێ هیممەتێ**
**بەسییە نەزانیی، عیلم و سەنعەتێ      سووکیی هەتا کەی؟ ناوێ، حورمەتێ**
**هۆش و بیرت بێ، پیاوی ژیرت بێ      لەجێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ؟**

پێنج مانگی دیکە لەدەرگای سەددەی بیستویەک دەدەین کەچی کورد هێشتا دەبێ ئەو هاوارەی بێکەس بدات بەگوێی خۆیدا. ئایا خەڵکی کورد بیری لەوە کردۆتەوە کە دەیەوێت سەدەی داهاتووی چۆن بێت؟

CONTRACT
Political Journal

Number 4 July 1999

**If not believed in by its individuals, a nation never achieves statehood**

*In this issue:*

- *The failure of the Kurdish movements*
- *Kurdish journalism in southern Kurdistan*
- *Biological and Chemical weapons*
- *Memories from the battle field*
- *What does the news mean?*
- *Altash refugee camp in Rumadi*
- *Flying under a fake colour*
- *Read also about:*

*.....Kurdish Flag ......Year 2000......*

*.....................interviews.................*



**Mass graves of Anfal's victims**



**Some of Iraq's chemical arsenal**

*Some quotes:*

**"Some Kurds know MedTV station as "a nation in the sky""** Diler Akrei, a senior MedTV official.

**"The nature of the Kurdish movement is such that it neither can produce a national leader nor guarantee the Kurds their national rights"** Nasir Hafid (see the article in this issue).

**"I am nearly 50, so I am not so far from death. If I knew that my death had some meaning for peace, I would kill myself"** Abdulla Ocalan in an interview conducted through his lawyer to the Italian newspaper (Rome daily La Republica).

**"The death sentence was passed at the conclusion of a trial that violated both national law and international standards of a fair trial"** The London-based Amnesty International about the "Ocalan-trial"